نۆڤلێت

# پەپوولە باڵشکاوەکان



ئەحمەد کامەران



## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: پەپوولە باڵشکاوەکان

نووسینی: ئەحمەد کامەران

بابەت: ڕۆمان

چاپی یەکەم:2020

چاپ و بڵاوکردنەوە: ناوەندی سارا

ژمارەی سپاردن : ١٩٣٧

تێبینی:

ئـــەم نۆڤڵێتـــە، تـــەنیا لـــەهزری نووســـەر خۆیـــەوە هەڵقوڵاوە...

تەمووزی،٢٠٢٠

١

لــــە درەنگـــانی، شـــەوێکی گـــەرمای هـــاوینی ساڵی ١٩٩٦دا، منـــداڵێکی جـــوانی کـــورد، لەســـەر دەســـتی پـــوورە جەمیلـــەی مامانەوە،بەگریانـــەوە چاوەکـــانی ، لـــەنێو نیشـــتیمانێکی پـــڕ لـــە جـــەنجاڵی و نائـــارامی دەکاتـــەوە. هاوکـــات لەهـــەمان شـــەودا،ئەو منداڵـــە لەســـەر دەســـتی دایکـــی و بـــەبێ بـــوونی بـــاوکی ، نـــاوی لـــێ دەنرێت(هیوا)...

هیـــــــوا لەگــــــــەڵێک دا، چاوەکـــــــانی بـــــــەژیان هەڵهێنابوو،کـــــــــە بـــــــەردەوام ســـــــــەخترین و ناخۆشـــــــترین رۆژەکــــــانی ژیانیـــــان بینیوە.ئـــــەو نیشـــــتمانەی کـــــە هیـــــوای بچکۆلـــــە تێیـــــدا لـــــەدایکبوو، بەبـــەردەوامی گەلەکـــەی نێـــو ئـــەو نیشـــــــــــــتمانەدا،هیوایان بـــــــــــــەبینینی رۆژە خۆشـــــــەکانیان دەخواســـــــت بۆخۆیـــــــان و نەوەکانی پاش خۆیان ...

***

بـــەهۆی ســـەختی جـــەنگی نـــاوخۆوە، لەوســـاڵەی کـــــە هیـــــوا چاوەکـــــانی بـــــەژیان هـــــەڵهێنا بوو.هەرچەنـــــدە جەنگـــــە ناوخۆیەکـــــە دووســـــاڵ پـــێش لـــەدایکبوونی هیـــوا دەســـتی پێکردبوو،بـــەڵام

ئەوساڵەی هیوا کە لەدایک بوو ، ئیتر بەرەو دەستپێکی کۆتایی هاتنی جەنگە براکوژیەکەی نێوان ئەو دووهێزە سیاسیە کوردیەدا لەئارادابوو،چوونکە جەنگێک بوو،هیچ کاتێک گەلی کوردی باشوور بە خەیاڵی نەهاتبوو، تاوەکو دەهات جەنگەگەش رۆژ بەدوای رۆژ، قوڵتر دەبوو،لەهەمانکاتیشدا ماڵوێرانییەکی ئێجگار گەورەی بەدوایخۆیدا هێنا.

هاوکات، ئەو جەنگە ناوخۆیەش لەنێوان ئەو دوو هێزە سیاسیە کوردیە گەورەیەدا بوو کە ساڵانێک ببوونە تارماییەک بۆ رژێمی دیکتاتۆری بەعس. بەڵام هەرزوو ساڵان تێپەڕی بۆ ئەم دوو هێزە کوردیە،کە توانیان

لەپارچە داگیرکراوەکەی خۆیان،لەپاش ڕاپەڕینی خەڵکی باشووری کوردستان دا،دەسەڵات بگرنە دەست و خۆیان حوکمڕانی گەلەکەی خۆیان بکەن، بەڵام هەرزوو لەپاش سێ ساڵ لەحوکمڕانیکردنی گەلەکەی خۆیان، ئەمجارەیان بوونە تارماییەک بۆ گیانی خۆیان، کە تێیدا لوولەی تفەنگەکانیان ئاراستەی یەکتری دەکرد...

سەرباری هەموو ئەم ڕووداوانە،کەچی بەهۆی ئەو جەنگە ناوخۆیەوە،بەدەیان ڕۆڵەی نێو نیشتمانەکەی هیوا، بوونە قوربانی گولەی دەستی یەکتردا،کەئەمەش ئازارێکی گەورە بوو بۆ گەلی کوردی باشوور،کەتێیدا بەدەیان

دایکـــی جـــەرگ ســـووتاو کرد.لەگـــەڵ ئەوەشـــدا بەهەزاران منداڵ بێ باوک کران...

نیشـــتمانەکەی هیـــوا بەســـەر چـــوار پارچـــە دابەشـــکرابوو، بـــەڵام دووهێـــزە سیاســـیە کوردیەکـــەی نـــاو پارچـــە نیشـــتمانەکەی هیـــوا ، کـــە بـــە باشـــووری کوردســـتان ناســـرابوو ، بۆمـــاوەی چەنـــدین ســـاڵ کردیـــان بـــە دووبەشـــەوە،واتە لـــەنێو پارچەیـــەکی بچـــووکی نیشـــتمانەکەی هیـــوا ، دوو حکومـــەت هاتـــە ئـــاراوە .کـــە ئەمـــەش وایـــان کـــرد ژیـــان و بـــارودۆخی خـــەڵکی باشـــووری کوردســـتانی بەشـــــمەیت ســـــەختر ببێتەوە،بـــــەهۆی ململانێیەکانی ئەو دوو هێزە کوردیەوە...

هیــوا کــوڕە کــوردێکی خــەڵکی شــاری ســلێمانیە، دانیشـــتووی گـــەڕەکی مەڵکەندیە.بـــەڵام دایکـــی هیـــوا لـــە بنەڕەتـــەوە خـــەڵکی شـــارۆچکەی خانەقینـــە، بـــەهۆی دەســـپێکردنی شـــەپۆلێکی فراوانـــی راگواســـتنەوە لەلایـــەن رژێمـــی بەعســـەوە لەســـەردەمانی پێشـــوودا، ئیتـــر بەشـــێکی خێزانەکـــەی دایکـــی هیـــوا بـــەرەو شـــارەکانی تـــری کوردســـتان کـــۆچ دەکـــەن، هـــەروەها بەشـــێکی تریشـــیان خۆیـــان لـــە بەغـــداد و ئێـــران بینیـــەوە، ئیتـــر بـــۆ دواجـــاریش دایکـــی هیـــواش خـــۆی لـــەناو شـــاری ســـلێمانی بینییـــەوە، کـــە لەیـــەکێک لـــە دامودەزگاکـــانی ئەوشـــارە وەکو فەرمانبەر دەستبەکاربوو.

باوکی هیواش ناوی شەماڵ بوو، ناسرابوو بە شاماڵە رەش کە پیاوێکی چوارشانەی سمێڵ زلی گەورەبوو.شەماڵە رەش لەبنەڕەتەوە خەڵکی شاری سلێمانیە،کە لەهەمان ئەو فەرمانگەیە کاری دەکرد کە دایکی هیوای لێی بوو ، بەڵام شەماڵە رەش لەو فەرمانگایە نامێنێتەوە،راستەوخۆ خۆیی و بەشێک لە هاوڕێکانی خۆیان دەگەیننە نێو چیاکانی کوردستان، ئەمەش لەپێناو رزگارکردنی نیشتمانەکەی لە دەستی داگیرکەرانی رژێمی بەعس دا...

❊❊❊

سـەرجەم دەزگاکـانی ئـەمن و ئیسـتخباراتی بـەعس ،هـەرکاتێک گوێیـان لـەناوی شـەماڵە رەش بوایـە ، دەسـتبەجێ ئیسـتخبارات خۆیـان دەخسـتنە ئامادەباشـی بـۆ گرتنـی شـەماڵە رەش و هاوڕێکانی،ئەمـەش بـەهۆی ئـەو ئازایتیـەی کـە شـەماڵە رەش و هاوڕێکـانی هـەیان بـوو. ئەگـەرچی رۆژێکیـان لەلایـەن سـەرۆک سـەدام حوسـێنەوە، راگـەینراوێکی بڵاوکرایـەوە کـە تیایـدا ئامـاژەی بـەوەدابوو، هەرکەسـێک شـەماڵەرەش بـۆی بـە زینـدویی یـان مردوویـی بهێنێتـە پێشـی ، ئـەوە ئـەو کەسـە گـەورەترین خـەڵات دەکرێـت لەلایـەن سـەرۆکەوە. هەرچەنـدە لـەپاش ئـەو راگـەینراوەی سـەرۆک دا، شـەوێکیان هێزێکـی شـەماڵە رەش

لەشـــاخەوە بـــەرەو نـــاو شـــار دابـــەزیبوون ، کـــە دابەزینەکـــــــەیان ســــــــەبارەت بەهەنــــــــدێک ڕێکخســـتنی تایبەتـــەوە بـــوو ،کـــە دەبوایـــە لـــەنێو شـــاردا ئـــەنجامی بدەن،کـــە هاوکـــات لەگـــەڵ برادەرانـــــی ڕێکخســـــتنی نێـــــو شـــــاردا. کۆبوونەوەکـــەی ئەوشـــەوە ، لـــەماڵی عەدنانـــە چاوشـــین ئـــەنجام درا، کـــە عـــەدنانی چاوشـــین بەرێکخســـــتنێکی بـــەتوانا ناســـرابوو لەلایـــەن ســـەرکردایەتی شـــاخەوە. ئیتـــر ئـــەو شـــەوە پیشـــمەرگەیـــەکی زۆری شـــەماڵە ڕەش لـــەماڵی عەدنانـــە چاوشـــین کۆببونـــەوە، کـــەچی هـــەرزوو ئیســـتخباراتی بـــەعس ئەوشـــەوە ،زۆر بەتوونـــدی بـــۆنی شـــەماڵە ڕەشـــیان کردبـــوو لـــەناو ســـلێمانی دا، هەربۆیـــــە ڕاســـــتەوخۆ پـــاش نیوکـــــاتژمێر

هێزێکـــی زۆری بـــەعس هـــەڵیان کوتایـــە ســـەر ماڵەکـــەی عەدنانـــە چاوشـــین ، لەپاشـــان دەنگـــی تەقەیـــەکی زۆر بـــەناو گـــەڕەک بڵاودەکرایـــەوە ،کـــە خۆشـــبەختانە هێزەکـــەی شـــەماڵە رەش توانیـــان بەتوونـــدی بـــەرگری لـــەخۆیان بکـــەن و چـــۆک بـــۆ دووژمنـــان دانەنێن،لەهەمانکاتیشـــدا بەتوونـــدی پەرپـــەچی هێزەکـــانی بەعســـیان دایەوە.

ئـــەو شـــەوە شـــەماڵە رەش چـــۆکی نـــەداو تـــوانی لـــەوێ رزگـــاری بێـــت و دووبـــارە خـــۆیی و هاوڕێکـــانی بـــەرەو شـــاخ هەڵبێتـــەوە، بـــەڵام تـــەنها ئـــەو شـــەوە عەدنانـــە چاوشـــین و خێزانەکـــەی نـــەیان تـــوانی و رابکـــەن و ســـەرەنجام کەوتنـــە

پەپوولە باڵشکاوەکان
ژێـــر دەســـتی ئیســـتخباراتی بەعســـەوە ، کەتێیـــدا بەتوونترین شێواز ئەشکەنجە دەدران...

❊ ❊ ❊

شـــەماڵە رەش، بـــە پێشـــمەرگە و رێکخســـتنێکی بـــەتواناو ئـــازا ناســـرابوو لـــە نێـــو شـــاخ و شـــاردا . کـــە ئـــەویش ئـــەو رۆژانـــە بـــوو ، کەتێیـــدا گەلەکـــەی گیـــرۆدەی دەســـەڵاتێکی دیکتـــاتۆر ببـــوو، کـــە ئـــەو دەســـەڵاتەش نـــاوی لـــەخۆی نـــابوو رژێمـــی بـــەعس، کـــە هـــەموو خـــەڵکی بەســـەرجەم پێکهاتـــەکان و نەتەوکانـــەوە هێنـــابووە لـــەرزین. بـــەڵام کوردەکـــان قارەمـــان بـــوون و هـــیچ کاتێـــک چۆکیـــان بـــۆ ئـــەو دەســـەڵاتە نـــەداو بـــەڵکو

پەپوولە باڵشکاوەکان
بـــــەردەوام زەبـــــری کووشـــــندەیان لـــــە هێـــــزی بەعسدەدا.

❊❊❊

جـــــەمالی بیکەســـــی، کەبـــــە بـــــرا گـــــەورەی شـــــەماڵە رەش ناســـــرابوو، بـــــەڵام جـــــەمالی بیکەســـــی لەســـــاڵانی رابـــــردوو ، لەســـــەردەمی ئەوکاتـــــەی حـــــوکمڕانی ئەحمـــــەد حەســـــەن بـــــەکردا، واتـــــە پـــــێش هاتنـــــە ســـــەر دەســـــەڵاتی ســـــەدام حوســـــێن دا ، ئێوارەیـــــەک بـــــوو کـــــە دەنگـــــۆی کـــــوژرانی جـــــەمالی بیکەیســـــی و هەڤاڵـــــەکانی بڵاوکرایـــــەوە. کـــــەهاوکات کوشـــــتنەکەیان لـــــە نێـــــو ئەمنـــــە ســـــوورەکەی ســـــلێمانی بـــــوو، لەگـــــەڵ کۆمـــــەڵێک هـــــاوڕێی تێکۆشـــــەری خـــــۆی دا،تێیـــــدا

پەپوولە باڵشکاوەکان

دەســـترێژی گولـــە دەکـــرێن و ســـەرەنجام دەچنـــە ریزی کاروانی نەمری شەهیدانەوە.

ئەمنـــــە ســـــوورەکەی ســـــلێمانی، زینـــــدانێکی تـــــاریکی نێـــــو نیشـــــتمانەکەی هیـــــوا بوو،کـــــە بـــــەدەیان پەپوولـــــە لـــــەنێو ئـــــەو زیندانـــــەدا باڵـــــەکانیان شـــــکێنرا بـــــوون بەدەســـــتی داگیرکەرانەوە .

***

خێزانەکـــــەی شـــــەماڵە رەش ســـــەرجەمیان خـــــەباتگێرو شۆڕشـــــگێرێکی بـــــەتوانا بـــــوون لـــــە پێنـــــاو ســـــەربەخۆیی گەلەکـــــەیان دا. بەتایبـــــەتیش بـــــاوکی شـــــەماڵە رەش و لەگـــــەڵ بـــــاپیری دا ، کـــــە یـــــەکێک بـــــوون لـــــەپیاوە تێکۆشـــــەرەکانی گـــــەلی

کورد، کە لەسەردەمی،کۆماری مەهاباتەوە، دەستیان دابووە شۆڕش و خەباتکردن لەپێناو ئازادکردنی گەلەکەیان لە ژێر دەستی داگیرکەران دا. بەڵام هەرزوو دووژمنان زەفەریان پێ دەبەن و سەرەنجام لەگەڵ (قازی مەحەمەد) و کۆمەڵێک خەباتگێڕی دیکەدا کە لەنێویان دا باپیر و باوکی شەماڵە رەشیش تێدابوو،ئیتر بۆدواجار هەموویان لە گۆڕەپانی چوارچرا ،بەدەستی داگیرکەرانەوە لەپەتی سێدارە دەکرێن. لەپاشان ئیتر ئەم خەباتە ،بۆ شەماڵ و جەمال بەجێ دەهێڵنەوە ، کە بڕیار دەدەن لەسەر هەمان ڕێچکەی باوک و باپیریان بڕۆن، درێژە بەخەباتیان بدەن، هەربۆیە سەرەنجام ئەم دووبرایە

پەپوولە باڵشکاوەکان
پەیوەنـــــــــدی بەشۆڕشـــــــــەکانی باشـــــــووری کوردســـــــــتانەوە دەکەن،لـــــــەپێناو ئـــــــازادکردنی گەلەکەیان...

* * *

هیـــــوا دەبێـــــت بـــــە ســـێیەم منـــــداڵی نـــــاو خێزانەکەیان،هـــــــــــەروەها تاقانـــــــــــەی دوو خووشـــــکەکەی خـــــۆی بـــــوو بـــــەناوەکانی (تـــــارا و نـــــەرمین). بـــــەڵام خووشـــکە گەورەکـــەی هیـــوا کـــە نـــاوی تـــارا بـــوو، لـــە کـــاتی روودانـــی کـــۆڕەوە ملیۆنیەکـــــــەی ســـــــاڵی (1991) دا، ئیتـــــــر لەوکاتـــەوە لـــە خێزانەکـــەی جیادەبێتـــەوەو چیتـــر هـــیچ هـــەواڵێکی نامێنێـــت. ئەگـــەرچی بـــە لـــەدایک بـــوونی هیـــوا بـــوو بـــە پێـــنج ســـاڵی رەبەقـــە کـــە

تـــــارا هـــــیچ هـــــەواڵ و دەنگوباســــێکی نیە،کـــــە ئەمـــــەش ئیتـــــر لەوکاتـــــەوە ئـــــارامی و خۆشـــــی لەنێو خێزانەکەی هیوا نەهێشتبوو.

***

لـــــەکاتی کۆڕەوەکـــــەدا، تـــــارا ئەوکاتـــــە تەمـــــەنی تـــــەنها (دە ســــــاڵان) بـــــوو کـــــە لەخێزانەکـــــەی جیادەبێتـــــــــەوە ، ئەمـــــــــەش بـــــــــەهۆی ئـــــــەو سەرلێشــــێواویەی خـــــەڵکی بـــــەناکاو بەســـــەریان دا هـــــات، کـــــە دووبـــــارە رژێمـــــە دیکتاتۆرەکـــــەی بـــــەعس، لـــــەناکاو بـــــە شـــــێوازێکی کتـــــوپڕەوە بۆجـــــــارێکی دیکـــــــە پـــــــەلاماری ناوچـــــــەکانی کوردســــــتان و خــــــەڵکی کــــــوردی خێــــــر لــــــەخۆ نــــەدیوی دایــــەوە. کــــە ئەمــــەش وای لــــە خــــەڵکی

کــرد مــاڵ و حــاڵی خۆیــان بــەجێ بهــێڵن و پــەنا بەرنــە بــەر ســنورەکانی ئێــران و تورکیــا. ئیتــر لەوکاتــەوە تــاراش لــەنێو ئــەو سەرلێشــێواویەدا لــە خێزانەکــەی ون دەبێــت، ئــەو کــۆڕەوە ملیۆنیــەی کەبەســەر گــەلی کــوردی پارچــەی باشــووری کوردســتان دا هــات، بــە تۆڵەیــەکی رژێمــی بــەعس و ســەدام حســێن دانرا،ئەمــەش لــەپاش ئــەوەی کــە خــەڵکی باشــووری کوردســتان ، لــە ســەرەتای مــانگی ئــازاری (1991) دەســتیان دایــە راپــەرین و دەرکردنــی بــەعس لەســەرجەم ناوچــە کوردیــەکان و بــە کەرکوکیشــەوە، بــەڵام هــەرزوو بــەعس وەکــو تۆڵەیــەکی تــر لەبەرامبــەر بەگــەلی کــوردا ،هاوشــانی جینۆســاید و ئەنفالەکردنــەکانی

لەبەرامبـــەر بـــەکورد. بـــەڵام ئـــەمجارەیـــان لـــە کۆتـــایی مـــانگی ئـــازارو ســـەرەتای مـــانگی نیســـانی هـــەمان ئـــەو ســـاڵەدا، کـــۆڕەوێکی ملیـــۆنی گـــەلی کـــورد دەســـتی پێکـــرد، کـــە تێیـــدا بەهـــەزاران کـــەس بوونـــە قوربـــانی لەســـەر ســـنوورەکانی ئێـــران و تورکیادا،بەتایبـــەتیش سەرســـنورەکانی تورکیـــا ،چوونکـــە تورکیـــا ســـەرەتا ئامـــادە نـــەبوو،دەرگای خـــۆی بـــەڕووی کـــوردا بکاتەوە،بۆیـــە ســـەرەنجام بەشـــێکیان لـــەو دەشـــت و دەرەدا بـــەبێ نـــازی گیانیـــان لەدەســـت دا،کـــە لەنێویانیشـــدا تـــارا کچـــە قوربانیـــەکی ئـــەو کۆڕەوە بوو...

٢

ئـەو کاتــەی هیــوا لــەنێو سـکی دایکـی دایــە ،پـێش ئـــەوەی لەســـــەر دەســـــتی پـــــوورە جەمیلــــەی مامانــەوە بێتــە ســەر ئــەم ژیانــەدا... کــەچی دایکــی هـــەرزوو بڕیــاردەدات کــە ئــەو کۆرپەلەیــەی نــاو ســـکی لـــەبار ببـــات و نەیهێتـــە ئـــەم ژیانـــەوە، ئەمـــەش بـــەهۆی ئـــەوەی دایکـــی هیـــوا گوێبیســـتی هـــەواڵی کـــوژرانی شــــەماڵە رەشـــی هاوســـەری دەبێتـــەوە . کـــوژرانی شـــەماڵە رەش، لەئـــەنجامی ئـــەو جەنگـــە ناوخۆیـــەی گەلەکـــەی بـــوو کـــە لـــەنێوان ئـــەو دووهێـــزە سیاســـیە کوردیـــەوە

هەڵگیرسا بوو .کەساڵانێک لەشاخ و لەشاردا سەرقاڵی خەباتی چەکداری و ڕێکخستن بوون لە دژی ڕژێمی بەعس دا. بەڵام هەرزوو لەپاش ڕاپەرین و ئازادکردنی ناوچە کوردیەکانی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس و کەوتنە ژێر دەستی دەسەڵاتدارانی کوردو بەتایبەتیش ئەو دووهێزە سیاسیە کوردیە گەورەیە. ئیتر بۆ دواجار توانیان نیمچە سەربەخۆییەک بۆخۆیان دابمەزرێنن لە باشووری کوردستان، کە ئەمەش گەلی کوردی باشووری کوردستان دڵی بەو نیمچە سەربەخۆیەی خۆش بوو، چوونکە توانیان لە پاش زیاتر لەچەندین ساڵ لە قوربانی و ئەنفال و کیمیاباران و

جینۆسایدکردن و لەگەڵ چەندین ئازاری دیکە
کە بەرۆکی گەلی کوردی گرتبوو. بۆ دواجار
ئیتر ئەم گەلە چەوساوەیە، توانی بۆخۆی
نیمچە رۆشناییەک بەروویدا بکرێتەوە
لەباشووری کوردستان، ئەوکاتەش شەماڵە
رەشیش زەردەخەنەیەک بەسەر
رووخسارەکانی دا دەگەشێتەوە ،کە توانیویان
لەپاش هەموو ئەو خەباتەیان لەپێناو
گەلەکەیان دا،سەرەنجام توانیان نیمچە
بەرهەمێکیان بەدەست هێنا،بەڵام تەمەنی ئەم
نیمچە رۆشناییەی گەلی کوردی باشوور زۆر
کورت بوو، چوونکە هەرزوو دووبارە
تاریکاییەکی دیکە باڵیان بەسەر
داکێشایەوە،بەڵام ئەمجارەیان تاریکایەکە

رژێمـــی داگیرکـــەران نـــەبوون ، بـــەڵکو لـــەنێوان دوو هێـــزی نـــاوخۆیی کوردیـــەوە بـــوو ، کـــە ســـاڵانێکی دوورو درێـــژ خۆیـــان بەپاڵـــەوانی گۆڕەپـــانی خـــەباتی چەکـــداری و رێکخســـتەنەکان دادەنـــا لـــەنێو شـــارو شـــاخ دا... بـــەڵام بـــەچاوتروکانێک دا لـــە ســـەرەتای مـــانگی ئایـــاری (1994)وە، پەیوەندیـــەکانی نێـــوان ئـــەو دوو هێـــزە لـــەناخۆی خۆیانـــدا تێکـــدەچێت و ســـەرەنجام لـــەجیاتی ئـــەوەی لوولـــەی تفەنگـــەکانیان ئاراســـتەی دووژمنـــان بکـــەن ، کـــەچی ئاراســـتەی یـــەکتریان دەکـــرد . ئیتـــر دەرئەنجامەکـــەی شـــەڕێکی نـــاوخۆی توونـــدی لـــێ کەوتـــەوە، کـــە تێیـــدا بـــە هـــەزاران رۆڵـــەی

کـــــوردی نێـــــو نیشـــــتمانەکەی هیـــــوا بوونـــــە قوربانی دەستی یەکتر.

*** 

ئەگـــــەرچی دایکـــــی هیـــــوا لەلایەکـــــەوە هێشـــــتا برینـــــەکانی ونبـــــوونی کچـــــە گەورەکـــــەی ســـــارێژ نەبۆتـــــەوە، کـــــەچی لەلایـــــەکی تـــــرەوە لـــــە ئێوارەیـــــەکی کـــــش و مـــــاتی گەرمـــــدا ، ســـــاڵی ١٩٩٦، هـــــەواڵی کـــــوژرانی شـــــەماڵە رەشـــــی هاوسەری پێ دەگەینن.

پـــــاش مردنـــــی شـــــەماڵە رەش ، مردنەکـــــەی چەنـــــدین قســـــەو مقـــــۆ مقـــــۆی بـــــەدوای خۆیـــــدا بڵاوکرایـــــەوە. کـــــە هەرکەســـــێک لـــــە گـــــەڕەک و لـــــەم لاو لـــــەملا بەشـــــێوەیکی جیـــــاواز باســـــی کـــــوژرانی

شـــــەماڵ رەشـــــیان دەكـــــرد. هەنـــدێک مقـــۆ مقـــۆ
بڵاوكرایـــەوە كـــە گوایـــە شـــەماڵ رەش دەســـتی
خـــۆی لەگـــەڵ دووژمنـــەكانی گەلەكـــەی تێكـــەڵ
كردبوو،كـــە ســـەرجەم نهێنیـــەكانی شـــاخی بـــە
ئـــەمن و ئیســـــتخباراتی بـــــەعس داوە لـــــەكاتی
خـــۆی دا. ئیتـــر چەنـــدین چیـــرۆک و مقـــۆ مقـــۆی
تریـــان بـــۆی هەڵبســـتبوو، بـــەڵام خێزانەكـــەی
شـــــەماڵە رەش هـــــیچ بـــــاوەڕی بـــــەم قســـــە
هەڵەبســـتراوانە نـــەدەكرد كـــە بـــۆ هاوســـەرەكەی
دروســـتیان كردبـــوو، چوونكـــە ئـــەو شـــاماڵەكەی
خـــۆی بـــاش دەناســـی كـــە چەنـــدە كەســـێكی پـــاک و
نیشـــتمان پـــەروەر بـــووە بـــۆ خاكەكـــەی خـــۆی،
هـــیچ كـــاتێكیش شـــتێكی لـــەم جـــۆرە بـــەناو مێشـــكی
شـــــەماڵە رەش و خێزانەكـــەی دا نـــــەهاتبوو، كـــــە

خەیانـــــەت لـــــە نیشـــــتمان و گەلەکـــــەی خۆیانـــــدا بکـــــەن. بـــــەڵکو هـــــەموو خێزانەکـــــەی شـــــەماڵ لـــــەپێناو ئـــــازادی و ســـــەربەخۆیی گەلەکـــــەیان گیـــــانی خۆیـــــان بـــــەختکردبوو، بـــــەڵام لەهـــــەموو ســـــەردەمانێک و لەهـــــەر شۆڕشـــــێک دا کەســـــانی ئـــــازاو راســـــتگۆ بـــــەردەوام دووژمنگـــــەلێکی زۆری بـــــۆ پەیـــــدا دەبێـــــت ، کـــــە تێیـــــدا دووژمـــــن چـــــاوەڕوانی هـــــەلێک دەکـــــات بـــــۆی بێتـــــە پێشـــــەوە کـــــە ئـــــەو کەســـــە قارەمانـــــە لـــــەناو ببـــــات و یـــــان ناوبـــــانگی و قەرەمانیەتیەکـــــەی لـــــەپێش چـــــاوی خـــــەڵکی ناشـــــرین بکـــــات. خۆشـــــبەختانە نـــــاوی شـــــەماڵە رەش ناشـــــرین نـــــەبوو بـــــەڵکو کرایـــــە سیمبولی قارەمانی گەلێکی چەوساوە.

٣

ئەوکاتـــە پەشـــیمان دەبێتـــەوە بـــۆ لـــە بـــاربردنی ئـــەو منداڵـــەی ناوســـکی خـــۆی ، کاتێـــک دەڕواتـــە ژووری کتێبخانـــــــــــەی هاوســـــــــــەرەکەیەوە، راســـتەوخۆ بـــە چوونـــە نـــاو ژوورە تایبەتەکـــەی شـــەماڵی هاوســـەری ،زۆر هەســـتی بـــە ئـــارامی دەکـــردو وا هەســـتی دەکـــرد کـــە شـــەماڵەکەی زینـــدووە ، بەتایبـــەتی کاتێـــک لەســـەر مێـــز و کورســـــیە تایبەتەکـــەی شـــــەماڵ دادەنیشـــێت، هـــەرزوو بـــۆنی نووســـینەکانی شـــەماڵە رەشـــی هاوســـەری بـــەناو لووتـــەکانی دا دەڕوات، بـــەڵام

کاتێـــــک چـــــاوی دەکەوێتــــــە ســـــەر کاغـــــەزێکی داخـــراو، لەگـــەڵ گـــوڵێکی ســـووری جـــوان لەســـــەر کاغەزەکـــــــەی دانـــــــراوە، هـــــــەرزوو کاغەزەکـــــــە دەکاتـــــەوەو دەســــــت بەخوێندنـــــەوەی نامـــــەی نــــاو کاغەزەکـــە دەکـــات ، کەلـــەلا یـــەن شـــەماڵە رەشـــی هاوسەریەوە بۆی نووسراوە .

دەقـــــــــی نامەکـــــــــەی شـــــــــەماڵە رەش بـــــــــۆ هاوسەرەکەی:

ســــــەرەتا ســــــڵاوت لــــــێ بێــــــت ئــــــەی جـــــوانترین هاوســـــەری مـــــن، ئـــــەی جـــــوانترین دایکـــــی جیهـــــان ، گیانەکـــــەی مـــــن ئـــــەی هـــــەموو کەســـــەکەم ، ئـــــەی

پەپوولە باڵشکاوەکان

پشـــت و پەناکـــەی مـــن ، ئـــەی جـــوانترین دایکـــی تارا و نەرمین...

ئـــەم نامەیـــەت بـــۆ دەنووســـم و لەســـەر مێزەکـــەم بـــۆتی بـــەجێ دەهـــێڵم بـــۆ رۆژی خـــۆی، رەنگـــە مـــن رۆژێـــک بێـــت ماڵئـــاوایی لـــە هـــەمووتان بکـــەم، بەتایبـــەتی لـــە ئێســـتادا کـــە دۆخـــی نـــاوخۆی، نێـــوان دوو هێـــزە کوردیەکـــەمان بـــاش نیـــە، بـــۆنی خـــوێنیًکـــی مەترســـیدار دەکـــەم لـــەنێوان هەردوولا،بۆیـــە رەنگـــە مـــن و هـــەزارانی دیکە،لەهەرچرکەســـاتێکدا ببینـــە قوربـــانی لـــەنێوان ململانێکـــانی ئـــەو دووهێزەدا،بەڕاســـتی هـــیچ کاتێـــک جـــەنگێکی نـــاوخۆیی بـــەم شـــێوەیە بـــەناو مێشـــکی مـــن دا نەهاتبوو،کەلـــەنێوان

خۆمـــان دا بـــەرپای بکـــەین ،چوونکـــە تـــەنیا زیـــان بەخۆمان دەگەینین و هیچی دیکە.

بـــەڵام گیانەکـــەم تکایـــە، ئەگـــەر رۆژێکیـــان هـــاتوو ئێمـــــە بووینـــــە خـــــاوەنی منـــــداڵێکی کـــــورِ ، بـــــا هـــەرزوو نـــاوی لـــێ بنێـــین (هیـــوا)، چوونکـــە مـــن ئەوکاتـــەی چـــەکم کـــردە سەرشـــان و بـــەرەوچیا ســـــەختەکان رۆیشـــــتم ، تـــــەنها بـــــەو هیوایـــــەوە رۆیشـــــتم، کـــــە بتـــــوانم ئـــــازادی و ســـــەربەخۆیی بەدەســـــتبهێنم بـــــۆ گەلـــــە چەوســـــاوەکەی خـــــۆم، جگـــە لـــەوەش مـــن زۆر لـــەچاوەڕوانی هـــەواڵـــی کچـــــە گەورەکـــــەمم کـــــە دووبـــــارە پێمـــــان شـــادبێتەوە (تـــارا) گیـــان. بـــەڵام گیانەکـــەم ئەگـــەر رۆژێـــک هـــاتوو نـــەمتوانی، جـــارێکی تـــر بەدیـــداری کچـــە گەورەکـــەم شـــادبیمەوەو ،یـــاخود ئەگـــەر

پەپوولە باڵشکاوەکان
نـــەمتوانی لـــەدایکبوونی کوڕەکـــەم ببینـــنم ،ئـــەوا پێیـــــان بڵـــــێ ،کـــــەباوکتان ئێـــــوەی زۆر خۆشەویت...

شەماڵە رەش، ئایاری) 1994(

* * *

نامەکـــەی شـــەماڵە رەش ، بـــۆ هاوســـەرەکەی پـــێش دوو ســـاڵ بـــۆی نووســـیبووی کـــە لەســـەر مێـــزی کتێبخانەکـــەی لـــە تەنیشـــت دەفتـــەرو قەلەمەکەیـــەوە بـــۆی بەجێهێشـــتبوو،چوونکە لەوکاتـــەوە ئیتـــر ناوبـــەناوە ئـــاڵۆزی و دەنگـــی گولـــە لـــەنێوان دوو هێـــزە کوردیەکـــە دەســـتی پێکردبـــــوو ، لەپاشـــــانیش هـــــەرزوو ئاگەربەســـتێکی کاتیـــان دەبەســـت بـــۆ راگرتنـــی

جـــــەنگ. بــــەڵام پـــــاش ئاگربەســــــتە کاتیەکــــەی نێوانیـــان، جـــارێکی دیکــە جــەنگ ئـــاڵۆزی دەســـتی پێکردەوە،تاوەکو کۆتایی ساڵانی 1996...

*** 

لەنامەکــــەدا شـــــەماڵە رەش داوای رۆژێکـــی لــــەو جــۆرەی کردبــوو کــە منــداڵێکی کوڕیـــان هـــەبێت و نـــاوی لـــێ بنێن(هیـــوا) ، هەربۆیـــە ئیتـــر ئەوکاتـــە دایکــــی هیـــوا لـــــەپاش خوێندنـــــەوەی نامەکــــەی هاوســــــەری، راســــــتەوخۆ بەگریانـــــەوە دەیخاتـــــە ســــەر ســـینگی خـــۆی. دەســـتبەجێ ئیتـــر پەشـــیمان دەبێتـــەوە بـــۆ لــــە بـــاربردنی ئـــەو منداڵـــەی نـــاو ســـکی کـــە ئـــەویش هیـــوا بـــوو، بۆدواجـــار لەســـەر دەســــــتی پـــــوورە جەمیلـــــەی مامانـــــەوە کوڕێــــک

پەپوولە باڵشکاوەکان

بـــــەناوی هیـــــواوە  لەگـــــەرمای هـــــاوینی ســـــاڵی (1996) هێنرایـــــە ژیـــــان. ئەوکاتـــــەی کـــــە هیـــــوا چـــــاوە جوانـــــەکانی بـــــەژیان کـــــردەوە ،کـــــەچی بـــــاوکی  هەفتەیـــــەک پـــــێش لـــــەدایکبوونی کوڕەکـــــەی لـــــە بۆســـــەیەکی تـــــەم و مژاویـــــدا، کۆتـــــایی بـــــەژیانی خۆیی،لەگـــــەڵ چەنـــــد هاوڕێیەکی نزیکی هات.

ئەگـــەرچی هـــیچ کاتێـــک بـــەعس نـــەیتوانی شـــەماڵ و هاوڕێکـــانی لـــــەناو ببات،بـــــەڵام  بەدەســـــتی نـــــاوخۆدا زۆر بەئاســـــانی کۆتـــــایی بـــــەژیـــانی هات...

٤

بـــاوکی هیـــوا جگـــە لــــەوەی کــــە پیـــاوێکی پێشـــــمەرگەو شۆڕشـــگێر بـــوو، لەهەمانکاتیشـــــدا خوێنـــــەر و شـــاعیرێکی بەســـــەلیقە بـــوو، کــــە لەتەمـــەنی گەنجێتیـــەوە خولیـــای بـــۆ خوێندنـــەوە و نووســـینی شـــعر پەیـــدادەبێت، ئەمـــەش لــــەپاڵ پێشـــمەرگایەتیەکەیدا. لەگـــەڵ ئەوەشـــدا شـــەماڵە رەش زۆر کاریگـــــەر دەبێـــــت بــــە شــــعرەکانی شـــێرکۆ بێکـــەس و نـــالی و مـــەحوی. هەربۆیـــە بـــەهۆی ئـــەو کاریگـــەر بوونەیـــەوە بـــۆ ئـــەو شـــاعیرانەی کـــورد راســـتەوخۆ دەســـت بـــۆ نووســـینی شـــعری سیاســـی و دڵـــداری دەبـــات. بەتایبـــەتیش خـــۆی بـــۆ شـــعری سیاســـی تـــەرخانکردبوو لـــەو ســـەردەمەدا،ئەمەش بـــەهۆی

ئـــــەوەی ســــــەردەمی شـــــەماڵە رەش ســــــەردەمی شـــۆڕش و خـــەباتکردن بـــوو لـــەپێناو ئـــازادکردنی گەلەکـــــەی دا، ئیتـــــر هەرئەمـــــەش وای لێکردبـــــوو زیـــــاتر شــــعری سیاســـــی بنووســـێت وبڵاویــــان بکاتــــەوە. کـــــە تێیـــــدا ســــــەرجەم ئازارەکـــــانی گەلەکـــــەی لــــە رێگـــــای شــــعرەکانیەوە دەگاینـــــدە بــــەر گـــــوێی داگیرکــــەرانی ئەوکاتــــەی رژێمـــــی بــــەعس دا، هەرئەمـــــەش وای لـــــە بـــــەعس کردبـــوو کـــە بـــە زینـــدوویی یـــان بـــە مردوویـــی شـــەماڵە رەش بکەوێتــــە ژێـــر دەســــتیان ،چوونکـــــە وەکـــــو تارماییەک وابوو بۆ سەرکردایەتی بەعس.

شــــەماڵە رەش پیاوێـــک بـــوو خـــاوەن بیرێکـــی ئازادیخوازانـــــــــــــــە بـــــــــــوو بــــــــــــۆ نیشتمانەکەی،لەهەمانکاتیشــــــدا زۆر ئاشـــــــنایەتی

لەگـــەڵ کتێبـــە فەلســـەفیەکان و فەیلەســـووفەکانی جیهـــان هـــەبوو، کـــە زۆر پێیـــان سەرســـام بـــوو، لەنێویشـــیاندا زۆر سەرســـام و کاریگـــەر بـــوو بـــە کـــارل مارکســـی فەیلەســـووف و لەگـــەڵ نیچـــە، هـــەروەها ناوبـــەناو لـــە رۆژنامـــەکانی ئـــەوکات کـە دەردەچـوون، تێیـدا دەقـە شـعریەکانی تێـدا بڵاودەکرایـــەوە ، کـــە تـــوانی ببێتـــە جێگـــای دڵخۆشی خوێنەرانی...

٥

هیـــوا کاتێـــک تەمـــەنی دەبێـــت بـــە شـــەش ساڵان،ســـەرباری ئـــەوەی منـــداڵێکی بـــێ باوکـــە و شـــەوان بـــەدەم خـــەوەوە بەبـــەردەوامی دەڵێـــت: بابـــە گیـــان ، بابـــە گیـــان ، بـــەڵام بابـــە گیـــان دەمێـک دەبێـــت بـــە گولەیـــەکی ســـارد کۆتـــایی بـــەژیانی هـــاتووە. کـــەچی لەلایـــەکی دیکـــەوە نـــەرمینی خووشـــکی بـــەهۆی دەرکـــەوتنی پەڵەیەکـــەوە لەســـەر دڵـــی ، ئیتـــر بـــۆ دواجـــاریش ئـــەو پەڵەیـــەی

سەر دڵی خووشکی، دەبێتە هۆی ماڵئاوایی کردن لە خێزان و نیشتمانە تاریکەکەی .ئەوکاتەی نەرمین ماڵئاوایی دەکات،دایکی هیوا تەنها لە شیوەن و گریان زیاتر هیچی تری لەدەست نەدەهات کە پەنای بۆ ببات،چوونکە ئەو تەمەنێکی خۆی بەردەوام ، بە شیوەن گریان بۆ تارای کچی و شەماڵە رەشی هاوسەری بەڕێکردوە،کەچی ئێستاش دووبارە بۆ نەرمینی کچە بچووکی دەست بەشیوەن گریان باوکە رۆیەتی .

نیشتمانەکەی هیوا، پڕیەتی لەهەزاران دایک و ئافرەتی جەرگ سووتاو کە بەردەوام شین و رۆ... رۆ یەتیان بۆ رۆڵەکانیان و هاوسەرەکانیان...

❊❊❊

هیوا ئەوکاتە تەمەنی زۆر بچووکە تەنها شەش ساڵە،کەچی لەلایەک باوکی نەماوە ،هەروەها چارەنووسی خووشکە گەورەکەیشی نادیارە،لەسەرووی ئەمانەوە خووشکەکەی تریشی کۆچی دوایی کرد بۆ هەتا هەتایە.بەڵام هێشتاکە هیوا لەنێو بەهاری تەمەنی منداڵی خۆی دایە، هەربۆیە ناتوانێت بەشێوەیەکی فراوان فامی رووداوەکانی دەورووبەری خۆی بەتەواوەتی بکات...

ئەگـــەرچی دایکـــی هیـــوا ئـــافرەتێکی جـــوان و گـــەنج بـــوو ، کـــە هێشـــتا توانایـــەکی بـــەهێزی جەســـتەیی بەخۆیـــەوە مـــابوو ،بـــۆ درووســـکردنی ژیـــانێکی نـــوێ تـــر لەگـــەڵ پیـــاوێکی دیکـــەدا. بـــەڵام دایکـــی هیـــوا هـــەموو خۆشـــیەکانی ژیـــانی خـــۆی لـــە ســـووچێکی نێـــو دڵـــی دا زینـــدانی کردبـــوو. چوونکـــە ئیتـــر ئـــەو بـــاوەڕی وابـــوو لـــە ئێســـتادا تاکـــە خۆشـــی ئـــەو لـــەم ژیانـــەدا، بریتیـــە لـــە بەرپرســـیارەتی دایکایـــەتی ،کـــە دەبێـــت زۆر بـــە هەســـتیارانە مامەڵـــە لەگـــەڵ ئـــەو بەپرســـیارەتیەدا بکـــات ، لەبەرامبـــەر منداڵـــەکانی دا بەتایبـــەتی لـــە ئێســـتادا کـــە تـــەنیا هیـــوای لـــەلا ماوە،هـــەروەها بەبـــەردەوامی ئـــاواتیش دەخوازێـــت بـــەنزیکترین کـــات هـــەواڵی گەڕانـــەوەی کچـــە گەورەکـــەی

ببیســـتێت، بـــۆ ئـــەوەی بتوانێـــت بـــۆ جـــارێکی دیکـــە لـــە باوەشـــی بگرێتـــەوەو تێـــر ...تێـــر مـــاچی رووەمەتـــەکانی تـــارای کچـــی بکات،بەگەڕانـــەوەی تـــارا، دەبێتـــە هۆکارێـــک بـــۆ ئارامبوونـــەوەی دایکی...

٦

ئـــەو داهاتـــەی کـــە دەســـتی دایکـــی هیـــوا دەکـــەوت لـــە پیشـــەی فەرمانبەریەکـــەی، بڕێکـــی ئێجگـــار کـــەم بـــوو، لـــەچاو ئەوداهاتـــە زۆرەی کـــە لـــەنێو خاکەکـــەی دا هـــەبوو، ســـەرباری ئـــەوە هیـــواو دایکـــی لەســـەر خاکەکـــەی خۆیـــان کرێچـــی بـــوون و خـــاوەنی هـــیچ موڵکێـــک نـــەبوون ،ئەمـــەش لـــەپاش هـــەموو ئـــەو قوربـــانی و خەباتانـــەی کەلەلایـــەن هاوســـەرەکەیەوە ئـــەنجام درابوو...

*** 

کتێبخانـــــــــە رەنگینەکـــــــەی بـــــــاوکی هیـــــوا ، ســــــالانێکی زۆر دەبێــــــت کـــــەس ســــــەردانی نـــەکردبوو ، هـــەموو کتێبـــەکانی نێـــو کتێبخانەکـــە بـــەداخراوی ماونەتـــەوە، تـــۆزێکی ئێجگـــار زۆری بەســــەردا نیشـــتبوونەوە، بـــەڵام لەمـــەو بـــەدوادا هیــــــوا ئیتـــــر ژووری کتێبخانەکـــــەی بـــــاوکی دەکاتـــەوەو لەســــەرمێز و کورســــیە تایبەتەکـــەی بـــاوکی دادەنیشـــێت ،لەگـــەڵ ئەوەشـــدا ناوبـــەناوە دەســــــت دەکـــــات بەخوێندنــــــەوەی هەنـــــدێک لەکتێبــــــەکانی نێــــــو کتێبخانەکـــــەی بــــــاوکی. ئەگـــــەرچی هیـــوا لـــــە بەشـــێکی کتێبـــــەکان تێنەدەگەیشـــت بـــەهۆی بچـــووکی تەمەنیـــەوە کـــە تـــەنها ئەوکاتـــە، نۆســـاڵان بـــوو کـــە بۆیەکـــەم جـــار

ژووری کتێبخانەکـــــەی بـــــاوکی دەکاتەوە،بــــەڵام وەکـــو بـــاوکی خولیـــا و هەســـتێکی تایبـــەتی بـــۆ وشـــــەکان و کتێبـــــەکان هەبوو،بەتایبـــــەتیش زۆر خولیـــای بـــۆ کتێبـــە مێژوویـــەکان و ئەدەبیـــەکان دەڕۆیشت.

هیـــوا هـــەموو کتێبـــەکانی ، نێـــو کتێبخانەکـــەی بـــــاوکی ، ســــەرلەنوێ خاوێنیـــــان دەکاتـــــەوەو جـاریکی دیکــە لــە شــوێنی خۆیــان بــەڕێکی دایــدە نێتـــــەوە، هـــــەروەها ژوورەکــــەش زۆر بـــــەجوانی خـــــاوێن و ڕێــــک پێکــــی دەکــــات و دەیکاتـــــە ژووری تایبـــــەتی خـــۆی. چوونکــــە ئیتـــر هیـــوا هەســـتی دەکـــرد بـــاوکی لەگـــەڵیان ناژیـــت، بـــەڵام هەســـتی بـــەوە دەکـــرد کـــە بـــاوکی گـــەورەترین شـــتی لـــەپاش خـــۆی بـــۆی بـــەجێ هێشـــتووە ،کــە

ئـــــەویش ژووری کتێبخانەکـــــەی خـــــۆی بـــــوو ،کـــــە ئەمـــــەش بـــــۆ هیـــــوا دەبێتـــــە ســـــەرچاوەی زانیـــــاری و بیرەوەریـــــــەکانی باوکـــــــە قارەمانەکـــــــەی. لەگـــــــەڵ ئەوەشـــــــدا هـــــــەموو دەقـــــە شـــــعریەکانی باوکیشـــــی لـــــــە دەفتەرێکـــــــدا کۆیـــــــان دەکاتـــــــەوە،تاوەکو لەدەرفەتێکـــــــدا بتوانێـــــــت لەیـــــــەکێک لـــــــە چاپخانـــــــەکانی شـــــــارەکەی بـــــەچاپی بگەیـــــەنێت و بڵاوی بکاتەوە بۆی....

ڕۆژێکیـــــان مامـــــە ئیســـــماعیل کـــــە خـــــاوەنی یـــــەکێک لەچاپخانـــــــەکانی شـــــــاری ســـــــلێمانی بـــــــوو، هاوکـــــاتیش هاوڕێیـــــەکی نزیکـــــی بـــــاوکی هیـــــوا بـــــوو، لـــــە ســـــەردەمی شـــــاخ و بەتایبـــــەتیش لـــــەکاتی ڕێکخســـــتەنەکانی نێـــــو شـــــاردا، کـــــە شـــــەماڵە ڕەش بەکەســـــێکی قارەمـــــان و چـــــاوکراوە داینـــــابوو.

لەگـــەڵ ئەوەشـــدا هـــەروەکو دووبـــرا وابـــوون بـــۆ یـــەکتری. ئیتـــر شـــەویکیان ســـەردانی مـــاڵی هیـــوا دەکـــات ، بـــۆ ئـــەوەی لەتەندرووســـتی براژنـــی و هیـــوا بپرســـێت. لەپاشـــان داوا لـــەهیوا دەکـــات کـــە بـــڕوات هـــەموو دەقـــە شـــعریەکانی بـــاوکی بـــۆ بهێنێـــــت ،تـــــاوەکو لەدەرفـــــەتێک دا بـــــەچاپی بگـــەینێت . هیـــوا دڵ خـــۆش دەبێـــت بەداواکـــەی مـــام ئیســـماعیل ، هیـــواش بـــەڕاکردن بـــەرەو ژووری کتێبخانەکـــــەی بـــــاوکی دا دەڕوات ، ســـــەرجەم دەقـــــە شـــــعریەکانی بـــــاوکی زۆر بـــەجوانی ڕێکـــدەخات ،لەپاشـــان دەیداتـــە دەســـتی مامـــە ئیســـماعیل،بۆ ئـــەوەی بـــەچاپی بگەیـــەنێت بۆی...

٧

ســـاڵ بـــە خێرایـــی تێپـــەڕی بـــۆ گـــەلی باشـــووری کوردســـــتان و تـــــەواوی دانیشـــــتوانی عێـــــراق، بەتێپـــەڕبوونی خێرایـــی ســـاڵدا،خەڵکی باشـــووری کوردســـــتان و عێـــــراق بەبیســـــتنی هـــــەواڵێک دەســـتیان بەئاهـــەنگ گێـــران کـــرد، ئـــەو ئاهەنگـــەش بـــــەهۆی رووخـــــان ولەســـــێدارەدانی گـــــەورەترین ســـتەمکاری مێـــژووی ســـەدەی بیســـت بـــوو. کـــە ئـــــەویش ســـــەدام حســـــێن بوو،کـــــە بـــــەپیاوێکی دیکتـــــاتۆر و مەترســـــیدار ناســـــرابوو،بەتایبەتیش بـــۆ گیـــانی گـــەلی کـــورد، بـــــەڵام لەســـــەرەتای

سـەدەی بیسـت و یەکـدا بەپـەتی سـێدارە کۆتـایی بەهەموودەسـەڵات و سـتەمکاریەکەی دا هـات کەلەبەرامبـەر بـە گـەلی باشـووری کوردسـتان و عێـراق ئـەنجامی دابـوو، خـەڵکی لـە دڵخۆشـیا نـەیان زانـی کـە چـۆن خۆشـیەکانیان دەربـڕن، بـۆ رووخـانی ئـەو دەسـەڵاتە دیکتـاتۆرو قێزەونـەی ، کەسـاڵانێکی ئێجگـار زۆر بـەرۆکی خـەڵکی عێـراق و بەتایبـەتیش کوردەکـانی گرتبـوو، کـە بـەردەوام بـوو لـە ئەنجامـدانی کیمیابـارانکردن و ئـەنفالی خـەڵکی باشـووری کوردسـتان و چەنـدین نەهـەماتی دیکـەدا کەگـەلی کـوردی باشـووری کورسـتان بەدەسـتی ئـەو دەسـەڵاتەوە چەشـتبووی، کـە هـیچ کاتێـک گـەلی کـورد ئـەو

ئازارانـــــەی لـــــەیاد ناچێتەوە،هــــەروەها نــــەوە لــەپاش نــەوەی ،نــێ, نیشــتمانەکەی هیــوا دەبێــت بزانێــت کــە گەلەکــەی چەنــدین ئــازاری گــەورە گــەورەی چەشتووە،بەدەســتی ئــەو رژێمــە یــەک بەدوای یەکانەوە.

لەلایـــەکی دیکـــەوە دایکـــی هیـــوا، هێشـــتا لـــە چـــاوەڕوانی هاتنـــەوەی کچـــە گەورەکـــەی دایـــە (تـــارا). کـــە ئـــاوات دەخوازێـــت هـــەروەکو چـــۆن مزگێنـــــی لـــــە ســـــێدارەدانی ســـــەدام حوســـــێنی بیســـت، بەهـــەمان شـــێوەش رۆژێـــک بێـــت لەلایـــەن فریشـــــــتەکانەوە، مزگێنـــــــی هـــــــەواڵی کچـــــــە گەورەکــــەی تــــارای پێــــی بــــدەن، کــــە ئــــەو مزگێنیـــەش دەبێتـــە گـــەورەترین دڵخۆشـــی بـــۆ دایکی هیوا لەتەواوی ژیانی.

٨

تـــــاوەکو دەهــــــات ، ژمـــــارەی ســـــاڵەکان  بــــەبێ ئـــەوەی هەســـتی پـــێ بکرێـــت زۆر  بـــە خێرایـــی تێپـــــــــەڕی ،لەگـــــــــەڵ خێـــــــــرا تێپــــــــــەڕینی ســـــاڵەکاندا،هیواش دەبێـــت بـــە کـــوڕێکی گـــەنج و دایکیشـــــــــی تەمـــــــــەنی بـــــــــەرەو هەڵکشـــــــان دەڕوات،کــــــەچی هـــــیچ دەنگوباســــــێکی  تـــــاراش لـــەئارادا نیـــە.  ئیتـــر  هیـــوا لـــە ســـەرەتای  قۆنـــاغی گەنجیەتیـــەوە، بەتـــــەواوەتی هەســــت بـــــە هــــــەموو جەنجاڵیـــەکانی دەورووبـــەری خۆیـــدا دەکـــات کـــە لـــــەنێو نیشـــــتمانەکەی دا دەگوزەرێت،بەتایبـــــەتیش

## پەپوولە باڵشکاوەکان

کاتێـــــک چـــاوی بـــــە لاپـــــەڕەکانی مێــــژوودا دەخشـــــــــــێنێتەوە،دبینێت بــــــــــەدەیان ڕووداوی گـــــــــەورە ، گــــــــەورە ڕووی داوە لــــــــــەنێو نیشــــــــــتمانەکەی و چواردەوریدا،بەتایبــــــــــەتیش کاتێـــک چـــاوی دەکەوێتـــە ســـەر مێـــژووی جـــەنگی نـــــاوخۆی گەلەکەی،ڕاســــــتەوخۆ لـــــەنێو دڵـــــی خۆیـــەوە دەڵێـــت: ئـــاخ ئەمـــە چیـــە! ئێمـــە خۆمـــان کــــــــەم کراوینەتـــــــە قوربــــــانی دەســــــــتی دووژمنان،کـــــــەچی لـــــــەناوخۆی خۆیشــــــــمانەوە دووژمنــــــــی یــــــەکتر بووینە،هەربۆیـــــە ئێمــــــە نەبووینەتـــــــەخاوەنی هــــــیچ شــــتێک چوونکــــــە خۆمــــان لـــــەنێو خۆمــــان دا دووژمنــــی یــــەکترین. بەڕاســـــتی ئیتــــر ئێســــتا دەزانــــم نیشــــتمانەکەی مــــن نیشتمانی (پەپوولە باڵشکاوەکانە)...

بـــەڵام هیـــوا هـــەموو ئـــەم شـــتانەی بـــەلاوە نا،چوونکـــە تاکـــە خـــەونی هیـــواو دایکـــی لـــە ئێســـتادا تـــەنها هـــەواڵی تارایـــە کـــە دووبـــارە پێیـــان شـــادبێتەوە، هەرچەنـــدە هیـــوا تـــەنها وێنەیـــەکی بچـــووکی خووشـــکە گەورەکـــەی خـــۆی بینیـــوە ،لەنێو ئەلبوومە گەورەکەی ماڵەوەیان...

ئێوارەیـــــەکی رۆژی هـــــەینی، هیـــــواو دایکـــــی بەســـــەردانێک بـــــەرەو ســـــەر گـــــۆری شـــــەماڵە رەش و نـــــەرمین دەڕۆن، کـــــە بـــــاوک و کـــــچ لەتەنیشـــــتی یـــــەکترەوە پاڵیـــــان داوەتـــــەوە لـــــەنێو چـــــاڵێکی تاریکـــدا، لەگـــەڵ خۆیـــدا هیـــوا کتێبـــە شـــعریەکەی بـــاوکی کـــە بـــۆی چـــاپیکردبوو لەلایـــەن مـــام ئیســـــــماعیلەوە ، لەتەنیشـــــــتی گۆڕەکەیـــــــەوە دایـــــــدەنێت و لەگـــــــەڵ کۆمـــــــەڵێک گـــــــوڵی

جۆراوجۆریشـــی بـــۆ دەخاتـــە ســـەر کتێبەکـــەی. هـــەروەها بەباوکیشـــی دەڵێـــت: بخـــەوە باوکـــە گیـــان بـــە ئـــارامی لـــەنێو ئـــەم گـــۆرە تاریکـــەدا ، مـــن شـــانازی پێتـــەوە دەکـــەم لـــەناوهاورێکانم کـــە بـــاوکم چەنـــدە پیـــاوێکی قارەمـــان بـــووە لـــە رۆژگـــاری ســـەختدا، کـــەچی هـــەر بـــەقارەمانیش مردیـــت، بـــەڵام بەشـــێکی هاورێکانـــت وەکـــو تـــۆ تـــا وەکـــو دوێنـــی بـــەناوی خـــەباتی چەکـــداری و پێشـــمەرگایەتی خۆیـــان بەخـــەڵکی ناســـاندبوو ، لـــە دژی رژێمـــە دیکتاتۆرەکـــەی بـــەعس دا ، کـــەچی لـــەپاش ئەوەی،کـــە ئیتـــر شـــۆڕش تـــەواو بـــوو هـــەموویان لـــەنێو شـــاخە ســـەختەکانی نیشـــتمانەکەم دابـــەزین. لەئێســـتادا بۆخۆیـــان لـــە نێـــو کۆشـــک و تـــەلارە بڵنـــدەکان دەژیـــن و لەگـــەڵ

## پەپوولە باڵشکاوەکان

چەنـــــــدین ئۆتـــــــۆمبیلی ئاوێنــــــــە رەشـــــــیان بەدوایانـــەوە دەڕوات، کـــە تەنانـــەت بـــە ئەســـتەم ســـــڵاوێکیش لەهـــــەژارەکان دەکـــــەن،ئای باوکـــــە ژیـــــانێکی زۆر نامۆیــــــە کـــــــە ئێمـــــە تێـــــدا دەژین،هەرچەنـــــدە رۆژ بــــــەرۆژ مـــــن چاوەکـــــانم زیـــاتر بکرێنـــەوە ئـــەوا شـــتی زۆر نـــامۆتر دەبیـــنم لـــــەچواردەوری خـــــۆم ، خۆشـــــمەویێت باوکـــــە گیـــــان ،بـــــەڵام تکایــــــە باوکــــــە  ئاگـــــات لەخووشــــــکەکەم  بێـــــت، چوونکـــــە ئـــــەو زۆر بچووکـــــە، بۆیـــــە  ئێســـــتا زۆر دەترســـــێت لـــــەنێو ئـــەم چاڵـــە تاریکـــەدا بەتـــەنیا،خوات لەگـــەڵ باوکـــە قارەمانەکـــەی من،خـــوات لەگـــەڵ ئـــەی خووشـــکە بچکۆلانـــە بێنازەکـــەی نێـــو نیشـــتمانی (پەپوولـــە باڵشکاوەکان)...

٩

ئــــاواتی چەنـــدین ســــاڵەی دایکـــی هیـــوا، لــــەکۆتایی بـــەجێ هێنـــرا . کـــە بـــەردەوام ئـــاواتی گەڕانـــەوەی کچـــە گەورەکـــەی دەخواســـت ، بـــۆ نـــاو خێـــزان و نیشـــتمانەکەی خـــۆی دا، بـــەڵام لـــە پـــاش زیـــاتر لـــە بیســـت ســـاڵ لـــە نـــەبوونی هـــیچ هـــەواڵێک و دەنـــگ و باســــــێکی دەربــــــارەی تــــــارا کچــــــی دا،بـــــەڵام دایکـــی هیـــوا ڕۆژێکیـــان لەلایـــەن خووشـــکێکیەوە کـــە ماڵیـــان لـــە ئێرانـــە، هـــەواڵێکی بـــۆ دەنێرێـــت کـــە

گوایـــە تـــارا لـــەماڵی ئێرانیـــەک دایـــە لـــە تـــاران بـــەناوی ئاغـــای شـــیرازی، بـــەڵام تـــارا لـــەپاش ئـــەو هەمووســـاڵەدا لـــە ئێســـتادا ئـــەو بۆتـــە کچێکـــی گەورەو،هـــەروەها تەمەنیشـــی بیســـت و نۆســـاڵە ، لەهەمانکاتیشـــــدا هاوســـــەرگیری لەگـــــەڵ کـــوڕێکی ئێرانـــی دا کـــردوە بـــەناوی مورتـــەزایی، بـــەڵام خۆشـــبەختانە کوڕەکـــە کـــوڕێکی زۆر بـــەڕێز و مـــەردە کـــە زیـــاتر لـــە حـــەوت ســـاڵە پێکـــەوە دەژیـــن بۆخۆیـــان، بەبەختـــەوەری و بـــەبێ هـــیچ کێشـــەیەک، ئـــەوەی کـــە جێگـــای دڵخۆشـــیە بـــۆ تـــارا ئەوەیـــە کـــە دایکـــی مورتـــەزایش هاونەتـــەوەی خۆیـــە ، خـــەڵکی لای کرماشـــانە،واتە ســـەر بەپارچەکـــەی دیکـــەی کوردســـتانە،کە بـــە رۆژهـــەڵاتی کوردســـتان

ناســـــــراوە، بـــــەڵام بـــــاوکی مورتـــــــەزایی، لەبنەڕەتـــــەوە ئێرانیـــــە خـــــەڵکی تارانـــــە، نـــاوی ئاغـــای حەســـــەنیە،هەروەها مورتـــــەزایی برایـــــەکی تـــری هەیـــە بـــەناوی عـــــەلی کـــە دەکاتـــە بـــرا گـــــەورەی مورتـــــــەزایی . بـــــــەڵام عـــــــەلی لەســـــەردەمانی جـــــەنگی هەشـــت ســـاڵەکەی نێـــوان ئێـــــران و عێـــــراق دا ، بـــــە فـــــەتوای رابـــــەری شۆرشـــــی ئەوکاتـــــەی ئێـــــران ، بریـــاردرا کـــــە عـــــەلی و هاوڕێکـــانی بەشـــداری جـــەنگ بکـــەن لـــە دژی عێـــــراق ،شــــان بەشــــانی لەگـــەڵ ســــووپای وڵاتەکـــەی دا، ئیتـــر لەوکاتـــەوە لـــە ئـــەنجامی ئـــەو جەنگە نەگریسەدا عەلی دەکوژرێت.

***

پاش ئەوەی تارا کە لە کۆرەوەکەی ساڵی 1991 وە لە خێزانەکەی خۆی ون دەبێت ، بەڵام لەلایەن ماڵێکەوە کە لەبنەڕەتەوە خەڵکی تارانن،کە ئەو ماڵەش بازرگانێکی دیاری تارانن بەناوی ئاغای شیرازی،ئیتر بۆدواجار، هەروەکو منداڵی خۆیان بەخێوی دەکەن، چوونکە ئەو خێزانە لەبنەڕەتەوە خاوەنی هیچ منداڵێک نەبوون، هەربۆیە ئیتر خێزانەکەی ئاغای شیرازی زۆر عاشقی تارا دەبێت و بڕیاردەدات بەخێوی بکات ،تاوەکو ئەوکاتەی دەبێتە کچێکی گەورە،بەڵام تارا هەمیشە خێزانە راستەقینەکەی خۆیی لەیادنەکردبوو.

ئەوکاتـــەی کـــە تـــارا، لـــە زانکـــۆی تـــاران دەخوێنێـــت لـــە بەشـــی پزیشـــکی دا کوڕێـــک دەناســـێت لەبەشـــەکەی خۆیـــدا، بـــەناوی مورتـــەزایی ، پـــاش ناســـینی راســـتەوخۆ دەکەوێتـــە داوی خۆشەویســـتی ئـــەو کـــوڕە ئێرانیـــەوە، ئیتـــر لـــەپاش تـــەواکردنی زانکۆیـــان تـــاراو مورتـــەزایی دەســـت لـــەنێو دەســـتی یـــەکتر دەنـــێن و دەچنـــە نێـــو هێلانـــەی بەختـــەوەری خۆیانەوە,لەگـــەڵ ئەوەشـــدا دەبنـــە خـــاوەنی منـــداڵێکی جـــوان، بـــەناوی نەرمینەوە.کـــە هـــەمان نـــاوی خووشـــکەکەی خـــۆیی لـــە کچەکـــەی دەنێـــت، بـــەڵام تـــارا بێئاگایـــە لـــەوەی خووشـــکەکەی لەژیان دا نەماوە .

تارا زۆر بیری خێزانەکەی خۆی دەکرد بەدرێژایی ئەو ساڵانەدا، بەڵام هیچ دەرفەتێکی بۆنەرەخسا کە بەخێزانەکەی شادبێتەوە ، جگە لەوەش تارا هێشتا بێ ئاگایە لەوەی برایەکی تاقانەی هەیە بەناوی هیواوە، کەچەندە تامەزرۆی بینینی خووشکە گەورەکەیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا بێ ئاگایە لەکۆچی دوایی باوکی و سەرجەم ڕووداوەکانی نێو نیشتمانەکەی...

١٠

بەهەمان شێوەی دایکی، تاراش لەلایەن مورتەزای هاوسەریەوە، هەواڵی ئەوەی پێ دەدات کە خێزانەکەی لە ژیان دا ماون و هەر لەسلێمانیەکەی خۆیان دەژین ، چوونکە مورتەزایی لەیەکەم شەوی هاوسەرگیریان بەڵێنی ئەوەی بە تارا دابوو، کە هەموو تواناکانی خۆی بخاتە گەڕ بۆ شادبوونەوە بەخێزانەکەی.

مورتەزایی ئەو هەواڵە بەتارا نادات کە باوک و خووشکەکەی لەژیان دا نەماوە،چوونکە دەیزانی کە تارا بەرگەی ئەو ئازارە ناگرێت. هەربۆیە مورتەزایی نەیدەویست ،تارای خۆشەویستی ئازاربکێشێت .

پاش هەوڵێکی زۆر مورتەزایی دەتوانێت لە رِێگای کۆمەڵێک هاورِێیەوە لە سلێمانی و ناوچەکانی دیکەدا،دەرئەنجام توانی ژمارە تایبەتیەکەی ماڵی خێزانە راستەقینەکەی تارا بەدەست بهێنێت ،ئەمەش دەیکاتە سوپرایزەک بۆ تارای خۆشەویستی...

❊❊❊

تـــاراش زۆر دڵخـــۆش دەبێـــت بـــەو ســـوپرایزە جوانـــەی هاوســـەرەکەی کـــە پێشکەشـــی کردبـــوو ، ئیتـــر راســـتەوخۆ بـــۆ شـــەوەکەی بـــە ژمارەیـــەکی تایبەتیـــەوە زەنگـــی تەلەفۆنەکـــەی مـــاڵی هیـــوا لێـــدەدرێت، لەوکاتـــەدا کـــە زەنگـــی تەلەفۆنەکـــە لـــێ دەدرێـــت، دایکـــی هیـــوا لـــە چێشـــــــتخانەدایە خـــــــەریکی ئامـــــــادەکردنی پارووییـــەکی نانـــە بۆئـــەوەی لەگـــەڵ هیـــوای کـــوڕی دا بۆخۆیـــان بیخـــۆن ، بـــەڵام هـــەرزوو دایکـــی هیـــوا خورپەیـــەک بـــەناو دڵـــی دا دێـــت و دەڵێت:دڵنیـــام ئـــەوە کچەکەمـــە، دەســـتبەجێ خێـــرا خـــۆی بـــەرەو تەلەفۆنەکـــە دەگەیـــەنێت و هەڵی دەگرێت و لەپاشان دەڵێت:

-بەڵی فەرموو کێیە؟

دایکـــی هیـــوا ،دوو جـــار لەتەلەفۆنەکـــەوە دەڵێـــت: فـــەرموو کێیـــت بـــەڕێزتان؟ بـــۆ قســـەیەک ناکـــەن؟! ئـــەلوو فـــەرموو کـــێن بـــەڕێزتان تکایـــە قســـەیەک بکەن کاتی گاڵتەکردن نیە بەم شەوە درەنگە.

-تـــاراش بـــەدەم گریانـــەوە،دەڵێت: دایکـــە گیـــان ، قوربـــانی هەناســـەکانت بـــم ، قوربـــانی ئـــەو دەنگـــە خۆشـــەت بم،دایکـــە مـــنم تـــارا کچـــە گەورەکـــەت لەدەورت گەڕێم دایکە جوانەکەم...

کاتێـــک دایکـــی هیـــوا گـــوێی لـــەم قســـەیە دەبێـــت راســـــتەوخۆ هەناســـــەیەکی قـــــوڵ هەڵـــــدەمژێت و بەگریانـــــەوە، لـــــەنێو تەلەفۆنەکـــــەدا، بـــــەدەنگێکی زۆر بـــەرزەوە بـــانگی کچـــە گەورەکـــەی دەکـــات و دەڵێت:تـــارا گیـــان، کچـــە تاقانەکـــەی دایـــە ئـــەی

پەپوولە باڵشکاوەکان

هەناسـەکەی دایـە ، دایـە بـەقوربانت بێـت ئـەوە تـۆی ؟ یـان ئەمـە خەونـە کـە مـن تێکـەوتووم بەم شەوە درەنگە؟!

-بـەڵێ دایـە گیـان مـنم تـارام، خـەون نیـە، بـەڵکو راسـتیەکی چاوەڕوانـەکراوە بۆمـان، مـن ئێسـتا لـە ئێرانـەوە قسـەت لەگـەڵ دەکـەم، هـەروەها دایکـە گیـان، لـەپاش ئـەو هەمووسـاڵەدا ،مـن ئێسـتا بوومەتـە کچێکـی زۆر گـەورەو هاوسەرگیریشـم کـردوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا منـداڵێکی جوانیشـمان بەقسـەت بـووە، نـاوی خووشـکەکەم لـێ نـاوە نـەرمین گیان بەڕاستی زۆر بیری هەمووتان دەکەم.

تـــارا: دایکـــە گیـــان پـــێم بڵـــی بـــاوکم چۆنـــە؟ هەروەها نەرمینی خووشکم چۆنە؟

تـــــارا بەهـــــەواڵ پرســــــینی خووشـــــکەکەی و باوکی،راســـتەوخۆ دایکـــی بـــۆ ســـاتێک بـــێ دەنـــگ دەبێـــت. تـــاراش لەتەلەفۆنـــەوە بـــە دایکـــی دەڵێـــت: ئەلوو دایکە بۆچی دەنگت نەما!

-کچەکـــەی خـــۆم، دایـــە بـــەقوربانت بـــێ بێـــدەنگ نەبوومـــە بـــەڵکو گوێـــت بـــۆ دەگـــرم. کاتێـــک وتـــت منـــداڵێکم بـــووە ، ناویشـــت لـــێ نـــاوە نـــەرمین ، بەڕاســـتی تاســـاندمی ، ئـــەی قوربـــانی کچەکـــەی خـــۆم بـــم ، پـــاش ئـــەو هـــەموو ســـاڵە بۆتـــە دایـــک ، بەڕاستی زۆر تامەزرۆی بینینتانم...

تـــارا دووبـــارە پرســـیاری تەندرووســـتی بـــاوک و خووشـــکی دەکات،بـــەڵام دایکـــی نایـــەوێـــت راســـتیەکەی پـــێ بـــڵ َێـــت کـــەچی روویـــداوە. هەربۆیـــە ناچـــار دەبێـــت درۆیـــەکی گـــەورە لەگـــەڵ کچەکـــەی بکـــات پێـــی دەڵێـــت: باوکـــت و خووشـــکت زۆر باشـــن،بەڵام تـــارا داوا لـــەدایکی دەکـــات کـــە تەلەفۆنەکـــەیان پـــێ بـــدات، بـــۆ ئـــەوەی قســـەیان لەگـــەڵ دا بکـــات و گـــوێی لـــەدەنگیان بێـــت، بـــەڵام دایکـــی دووبـــارە درۆیـــەکی تـــر دەکـــات و دەڵێـــت: کچەکـــەم هـــەردووکیان خەوتوون.

ئەگـــەرچی لـــەدیویکی تـــرەوە قســـەکەی دایکـــی هیـــوا ،زۆر راســـت بـــوو، چوونکـــە بـــاوک و خووشـــکەکەی تـــارا ، بـــۆ هـــەتا هەتایـــە چاوەکانیان لیک ناوەو خەوتون بۆخۆیان...

تـــاراش پـــاش قســـەکەی دایکـــی دەڵێـــت: باشـــە دایکـــە گیـــان هـــەڵیان مەســـتێنە، بـــا بخـــەون بۆخۆیـــان بەیانیەکـــەی زوو مـــن و مورتـــەزای هاوســـەرم لەگـــەڵ کچەکـــەم بەیەکـــەم فڕۆکـــە دەگەینـــە ســـلێمانی...ئیتر ئەوکاتـــە تێـــر ،تێـــر لـــە باوەشتان دەگرم.

-قوربانـــت بـــم کچەکـــەم تـــارا گیـــان بەخێربێیتـــەوە بـــۆماڵەکـــەی خـــۆت و نیشـــتمانە بێنازەکەت،ئەمـــە چەنـــدە هـــەواڵێکی خۆشـــە

بــۆمن. بــەڵام کچەکــەم تــۆ لــەپاش ئــەو هــەموو ســـاڵە بـــێ ئاگـــای لـــەوەی ، کـــە ئێســـتا تـــۆ برایەکیشـــت هەیـــە بـــەناوی هیوا،ئـــەو چەنـــدین ســـاڵە تامـــەزرۆی بینینـــی تۆیـــە ،بۆیـــە تکایـــە بـــەیانی زوو بگـــەڕێوە بۆلامـــان، لـــەم تەنیاییـــە ئێمـــە رزگـــار بکـــە ، تـــۆ دەبیتـــە تاکـــە رووونـــاکی ماڵەکـــــەمان، چوونکـــــە ماڵەکـــــەمان هـــــیچ رووناکیـــەکی تێـــدا نـــەماوە لـــەپاش دیارنـــەمانی تۆدا.

تـــارا کاتێـــک گوێبیســـتی ئـــەو قســـەیەی دایکـــی دەبێتـــەوە ، لـــەوەی کـــە برایـــەکی بچـــووکی هەیـــە ، زۆر دەشـــڵەژێت و خۆشـــیەکەی نـــاو نـــاخی دڵـــی، بەگریانێکی قووڵەوە دەری دەبڕێت....

تــــارا بـــــەدەم گریانــــەوە بـــــەدایکی دەڵێـــت: واتــــە پـــاش ئـــەو هـــەموو ســـاڵە برایەکیشـــم هەیـــە و مـــن ئاگـــەدار نـــیم؟ قوربـــانی بـــرا تاقانەکـــەی خـــۆم بـــم دادە لـــــــەدەوری گـــــــەڕێت، دایکـــــــە گیـــــــان تکایـــــــە تەلەفۆنەکـــــە بـــدە بـــــە کـــاکم دەمـــــەوێت هەرئێســــــتا گوێم لە دەنگی برا تاقانەکەی خۆم بێت.

-باشــــە کچەکـــــەم ئێســــتا بـــانگی دەکـــــەم بـــۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ دا بکەی...

هیــــوا... هیــــوا... هیــــوا... کوڕەکـــــەم وەرە خـــــوارەوە کەمێک کارم پێتە .

-بەڵی دایکە گیان ، چیت دەوێت؟

تـــۆ خێـــرا وەرە تەلـــەفۆنێکت بـــۆ هـــاتووە دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات...

-کێیە دایکە؟

-نـــازانم کـــوڕم ، نـــاوی خـــۆی نـــەوتوە ، تـــەنها گـــوتی: هیـــوام دەوێـــت،تۆ وەرە خـــوارەوە هـــەڵی گرە ، ئەوجاکە دەزانی کێیە؟

هیـــوا بـــەڕاکردن لـــە ژووری ســـەربانەوە ، کـــە لـــە ژووری کتێبخانەکـــەی بـــاوکی دایـــە بۆخـــۆی ،ســـــەرقاڵی خوێندنـــــەوەی کتێبێکـــــی مێژووییـــــە. راســـــتەوخۆ دێتـــــە خـــــوارەوەو تەلەفۆنەکـــــە هەڵـــــدەگرێت و دەڵێت:ئەلوو...ئـــــــەلوو، بـــــــەڵی فەرموو کێین؟ بەڕێزتان بەم شەوە؟

تـــاراش بـــە زەردەخەنەیەکـــەوە قســـە دەکـــات و دەڵێـــت : بـــەڕای بـــەڕێزتان دەبێـــت کـــێ بێـــت بـــەم شـــەوە ؟ بەتایبـــەتی کـــە کچێکـــی وەکـــو مـــن تەلـــەفۆن بـــۆ کـــوڕێکی قـــۆزی ســـلێمانی بکـــات ، کـــە ئـــەو کـــوڕە قـــۆزەش ناویشـــی هیـــوا بێـــت ،هیـــوا بەقســـەکانی تاســـێک دەبیـــات وهـــیچ شـــتێک ناڵێـــت ،بـــەڵام کاتێـــک تـــارا راســـتەوخۆ دەڵێـــت: ئەوە منم تاقانەکەی دادە گیان تارام...

-هـــەواڵێکی زۆر لـــەناکاو ، پـــڕ لـــەتاس بـــوو بـــۆ هیـــوا ،کەبـــەم شـــەوە کچێـــک تەلـــەفۆن دەکـــات ، راستەوخۆ پێی دەڵێت من تارای خوشکتم...

کاتێـــک هیـــوا گـــوێی لـــەناوی خووشـــکە گـــەورەکـــــەی دەبێتـــــەوە لـــــەنێو تەلەفۆنەکـــــەدا،

بەتاسەوە بانگی تارای خووشكی دەكات و پێی دەڵێت: تارا گیان خووشكە گەورەكەم ئەوە تۆی؟ تاراش بە گریانەوە دەڵێت: بەڵێ برا بچووكەكەم لەدەورت گەڕێم، بەڵێ خۆمم تارای خووشكت، پێم بڵێ براكەم تەندرووستیت چۆنە؟ هیواش بە زەردەخەنەیەكەوە پێی دەڵێت: زۆر ...زۆر...باشم بەتایبەتی كە ئێستا گوێم لەدەنگی تۆ بوو دادە گیان.

***

هیوا ئەوكاتەی كە گوێی لە دەنگی خووشكەكەی بوو،زۆر تووشی سەرسوڕمانی دێت،كە بەم شەوەو لەناوكاودا

کەسـێک بڵێت مـن خووشـکەکەتم لـەپاش ئـەم هەمووساڵەدا.

هیـوا بـەدایکی دەڵێـت: دایکـە ئـەوە تـارای خووشـکمە؟ دایکیشـی بـە پێکەنینـەوە وەڵامـی هیـوای کـوڕی دەداتـەوە دەڵێـت: بـەڵی کوڕەکـەم لـەکۆتایی دا ئیتـر پێـک شـادبووینەوە ، ڕۆژەخۆشـەکانی ژیانمـان دەسـت پێدەکاتـەوە لەگـەڵ تـۆ و خووشـکە گەورەکەت،قسـەی لەگەڵ بکە کوڕەکەم...

هیـوا: باشـە دادە گیـان تـۆ ئێسـتا لـە کوێیـت؟ تـاوەکو بـێم بـە شـوێنتاو بتهێنمـەوە بـۆ ماڵـەوە ،چوونکـە مـن زۆر بیـری تـۆم کـردوەو هـەروەها

دایکیشـــــم زۆر بیـــری تـــۆ دەکـــات، هـــەمووومان بۆت نیگەرانین لەپاش ئەم هەموو ساڵە...

-تـــارا: گیانەکـــەی دادە ، قوربـــانی تـــۆم، هیـــوا گیـــان مـــن لـــە ئێـــرانم شـــوێنێکی زۆر دوورە لـــە ســـلێمانیەوە ،هـــەروەها تـــۆ نـــاتوانی ئێســـتا بگەیتـــە لام بـــەم شـــەوە ، بـــەڵام گیانەکـــەم بـــەیانی خـــۆم و نـــەرمینی کچـــم لەگـــەڵ هاوســـەرەکەم بەیەکـــەم فڕۆکـــە دەگەڕێینـــەوە بـــۆ ســـلێمانیەکەم .منـــیش زۆر بیـــــــــری ئێـــــــــوەو ســـــــــلێمانیەکەم و کوردســـــــتانەکەم کـــــــردوە، ئیتـــــــر لەبەیانیـــــــەوە دەمـــەوێت خـــۆم و نـــەرمینی کچـــم، لـــەوێ بـــژیم لەگەڵ ئێوەدا بۆ هەتا هەتایە...

-هیـوا کاتێـک گـوێی لـەوە دەبێـت کـە تـارای خووشـکی منـداڵێکی بـووە ، راسـتەوخۆ دەڵێـت: ئـای خوایـە، واتـە دادە گیـان تـۆ منداڵشـت بـووە لـە پـاش ئـەم هـەموو سـاڵەوە، کـە لێمـان دابـڕاوی! ئێسـتاکە لەیـەک کاتـدا مـن ،چەنـدە بیـری تـۆ و خووشـکەزاکەم دەکـەم، هەربۆیـە بـەیانی خۆشـترین رۆژ دەبێـت بـۆمن ،چوونکـە ئـەبێت خووشـکەزاکەم و لەگـەڵ تـۆ تێـر ... تێـر لەباوەشـتان دەگـرم ، لەپاشـان تێـر بـەدڵی خۆمـان لەگـەڵ خووشـکەزاکەم پیاسـەیەک بەناو سلێمانی دا دەکەین.

تارا:بـەڵی کاکـە گیـان منـداڵێکمان بـووە، هـەروەها کچێکـی جوانـە، ناویشـم لـێ نـاوە

(نـــــــەرمین)، بەڕاســــــتی زۆر بیــــــری نــــــەرمینی خووشکم دەکەم....

*** 

کاتێــک گوێبیســـتی ئـــەوە دەبێــت لـــەزاری تـــارای خووشـــــکیەوە کـــــەناوی خووشـــــکەزاکەی نـــاوە (نـــەرمین ) . ئیتـــر ئەوکاتـــە هیـــوا بـــۆ ســـاتێک بـــێ دەنـــگ دەبێـــت و هـــیچ شـــتێک ناڵێـــت، چوونکـــە راســـتەوخۆ دەزانێـــت کـــە دایکـــی راســـتیەکەی بـــۆ تـــارای کچـــی نەدەرکانـــدوە، هەربۆیـــە هیـــواش ناچـــار دەبێـــت هـــەمان درۆی دایکـــی دووبـــارە بکاتـــەوە. تـــاوەکو ئەوکاتـــەی تـــارا هـــەموو رووداوەکان بەچاوەکانی خۆی دەبینێت.

-تــــارا بەهـــــەمان شــــێوە پرســــیاری، تەندرووســــتی بــــــاوکی و خووشـــــــکەی لەبراکــــــەی خۆیـــــــدا دەکات،بــــەڵام هیــــوا هــــــەمان وەڵامــــی دایکــــی دەبێت...

هیــــوا بــــەتارای خووشــــکی دەڵێــــت : نـــــەرمین و بــــاوکم خــــەوتوون بۆیــــە نــــاتوانن ئێســــتا قســــەت لەگــــەڵ بکــــەن، تــــاراش ئەوکاتــــە، هەســــتێکی نــــامۆ بەلایـــــەوە درووســــــت دەبێــــت کــــــە لــــــەم کاتــــــەدا بـــــۆچی دەبێـــــت نـــــەرمین و بـــــاوکی خــــــەوتبن ! چوونکە هێشتا کات زۆریش درەنگ نەبوو .

لــــەکۆتایی دا تــــــارا لــــــە تەلەفۆنەکەیــــــەوە بــــــە هیــــوای بــــرای دەڵێــــت: تــــۆش بــــڕۆ بخــــەوە براکــــەم، بــــەیانی هــــــەموومان پێــــک شــــاد دەبینــــەوەو تێــــر

بـــەدڵی خۆمـــان قســـە دەکـــەین، بـــەڵام لەســـەرەتادا ماچێکی دایکم لەبیر نەکەیت.

هیـــوا: باشـــە دادە گیـــان شـــەوت شـــاد بێـــت، بەیانی هەمووومان چاوەڕێت دەکەین...

## ١١

ئـــەو شـــەوە بـــۆ دایکـــی هیـــوا، لەهەمووشـــەوەکانی تەمـــــەنی جیـــاوازتربوو، چوونکـــــە پـــاش بیســـــت ســـاڵی رەبـــەق ، بـــۆ جـــارێکی تـــر تـــوانی گـــوێ لـــە دەنگـــــی کچـــــە گەورەکـــــەی خـــــۆی ببیێت،هــــەروەها ئـــەو شـــەوە دایکـــی هیـــوا لـــە دڵـــی خۆیـــەوە گـــوتی: ســـووپاس بۆتـــۆ خوایـــە، کـــە لـــەپاش ئـــەم هـــەموو ســـاڵە لـــە دووری کچـــە تاقانەکـــەم، کـــەچی توانیـــت بۆجـــــارێکی تـــــر پێکمـــــان شـــــادبکەیتەوە، خوایـــــە

گیـــان هـــەردایکێک وەکـــو مـــن لـــە رۆڵـــەکانی دابـــــڕاوە، بەگـــــەورەیی خـــــۆت پێکیـــــان شـــادبکەوە...(ئامین). بـــەڵام لەلایـــەکی دیکـــەوە دایکـــی هیـــوا زۆر نیگەرانـــە، بـــۆ ئـــەو درۆیـــەی لەگـــەڵ کچەکـــەی دا کـــردی ، چوونکـــە نـــەیتوانی ئـــەو راســـتیە تاڵـــە لەیەکـــەم گوێبیســـتی دەنگـــی کچەکەیـــــەوە پێـــــی بڵێـــــت: کـــــە بـــــاوک و خووشـــکەکەت نـــەماون لـــە ژیـــان دا. چوونکـــە ترســـی لـــەوە هـــەبوو کـــە تـــارای کچـــی شـــتێک لـــەخۆی بکردبایـــە لـــەپاش بیســـتنی ئـــەو هەواڵـــەی دەربارەی باوکی و نەرمینی خووشکی.

❊❊❊

پەپوولە باڵشکاوەکان

دڵ بۆ دڵی یەکتر لێ دەدات، تاراش بەهەمان شێوەی دایکی بە گریانێکی پڕ لە زەردەخەنەوە، لەتەنیشتی هاوسەرەکەیەوە لەسەر تەختەی شەوانی خۆشەویستیان پاڵکەوتوە بۆخۆی ،بەڵام پاڵکەوتنەکەی ئەمشەوی تارا لەسەر تەختەی خۆشەویستیان،جیاوازترە لەشەوەکانی دیکەدا. چوونکە ئەمشەویان وەکو شەوانی دیکە نیە ، کە بەدەم پێکەنینەوە لەگەڵ مورتەزای هاوسەری لەسەر جێگاکەیان ،شەوێکی سووری پڕ لەخۆشەویستی بەڕێ بکەن، بەڵکو تارا شەوێکی پڕ لە فرمێسکاوی بەڕێ دەکات...

تارا، ناو بەناوە تەماشای چرکەکانی کاتژمێری ژوورەکەی دەکات بۆئەوەی زوو خۆرهەڵبێت و بەیەکەم فڕۆکەی تاران بگاتەوە سلێمانیەکەی، تارا لەپاش ئەو هەموو ساڵە دا هیچ کاتێک سلێمانیەکەی خۆی لەیاد نەکردبوو، بەڵکو خۆشەویستی بۆ شارەکەی زیاتر لەدڵی چەسپابوو، هەروەها بەدرێژایی ئەو هەموو ساڵەدا ، هیچ کات زمانەکەی خۆی نەفەوتاندوە ،بەڵکو بەبەردەوامی پارێزگاری لێی کردوە، چوونکە تاکە شت کە تارای بەهێز کردبوو بوونی زمانەکەی بوو.

****

بـــەڵام لەلایـــەکی دیکـــەوە، چـــوونی تـــارا بـــۆ سـلێمانی کـــەمێک مورتـــەزایی نیگـــەران کـــرد، چوونکـــــە مورتـــــەزایی زۆر ئاشـــــقی تـــــارای خێزانیـــەتی، تـــارا بـــەلای مورتـــەزایی هـــەموو شـــتێکی ئـــەوە لـــەم ژیانـــەدا، لەگـــەڵ ئەوەشـــدا دایکـــی کچـــە جوانەکەیـــەتی. تاکـــە دڵخۆشـــی مورتـــەزایی لـــەم ژیانـــەدا ، ئـــەویش تـــەنها بـــوونی تـــارا و نـــەرمینی کچیـــەتی لـــەنێو ژیـــانی دا ،هـــەر بۆیـــە ئامادەیـــە هەمووشـــتێک لـــەپێناویان دا بکـــات بۆئـــەوەی گـــەورەترین ژیـــانی بەختـــەوەر بۆیـــان فەراهەم بکات...

١٢

مورتـــەزایی، بـــەڵێنی بـــەتارای خۆشەویســـتی دا, کـــە بەیانیەکـــەی لەگـــەڵی بـــڕوات بـــۆ ســـلێمانی و لـــــەوێ هـــــەموویان بـــۆ هـــــەتا هەتایـــــە بـــــژین بۆخۆیـــان ،بـــە بیســـتنی ئـــەم هەواڵـــە دڵـــی تـــارای زیـــاتر خۆشـــکرد ، چوونکـــە ســـەرەتا تـــارا وای دانـــابوو کـــە زۆر ئەســـتەمە مورتـــەزایی لەگـــەڵی دا بێـــت بـــۆ ســـلێمانی . ئەمـــەش بـــەهۆی ئـــەوەی دایـــک و بـــاوکی مورتـــەزایی ، لـــەم شـــارەدان و خۆیشـــی کـــوڕە فارســـێکە. بـــەڵام مورتـــەزایی هـــەموو شـــتێک بـــەلاوە دەنێت،بـــەڵکو لـــەم کاتـــەدا

پەپوولە باڵشکاوەکان
دەبێـــت بەپشـــت و پەنایـــەکی بـــەهێز بـــۆ تـــارای خێزانی .

ئەگـــەرچی ســـــەرەتا کـــە مورتـــەزایی ئـــەم قســـەیەی بـــە دایـــک و بـــاوکی گـــوت: راســـتەوخۆ بـــاوک و دایکـــی مورتـــەزایی کـــەمێک نیگـــەرانی بەســـــەر رووخســـــاریان دا هەڵکـــەوت، هـــەروەها دڵگـــەران بـــوون بـــەو قســـەیەی کـــوڕە تاقانەکـــەیان ، چوونکـــە مورتـــەزایی منـــداڵی تاقانـــەی دایـــک و باوکیـــەتی، لـــەپاش کـــوژرانی عـــەلی کوڕیـــان، بۆیـــە لـــە دووری کوڕەکـــەیان هەســـتێکی نـــاخۆش بۆ دایک و باوکی درووست دەبێت...

*** 

بـــاوکی مورتـــەزایی، کـــە بـــەئاغای حەســـەنی ناســـرابوو، دەســـتێک بەســـەر شـــانی کوڕەکـــەی دا دێنێـــت و پێـــی دەڵێـــت: کوڕەکـــەم مورتـــەزایی گیـــان، تـــۆ لـــەپاش مردنـــی بـــرا گەورەکەتـــەوە،بۆ ئێمـــــە تاقانـــــەی نـــــاو ماڵەکەمانی،هـــــەروەها دڵخۆشـــی تـــۆ دڵخۆشـــی ئێمەیـــە رۆڵەکـــەم، هـــەر ناخۆشـــیەکی تـــۆ ناخۆشـــی ئێمەیشـــە. تـــۆ ئێســـتا بـــڕۆ لەگـــەڵ خێزانەکـــەت بـــۆ هەرشـــوێنێک کـــە ئـــارەزووی دەکـــات، هـــیچ کـــاتێکیش هەوڵنـــەدەی دڵـــــــــی هاوســـــــــەرەکەت لـــــــــەخۆت بڕەنجێنیت،چوونکـــــە تـــــارای خێزانـــــت ئـــــەو کچێکـــی لێقـــەوماوە، هـــەروەهـــا ئـــەو بەشـــێکە لـــە قوربـــانی گەلەکـــەی خـــۆی ، کوڕەکـــەم گەلەکـــەی

تـــــارا بەســــەر چەنـــــدین ئـــــازاری ســــــەختەوە تێپەڕیون کەهیچ کاتێک ناتوانن لەبیری بکەن.

مــــن کابرایـــەکی ئێـــرانیم، بـــەڵام ئـــەوە لـــەبیر نەکــەی کوڕەکــەم، کــە ئــەم دایکــە جوانــەی تــۆ کــە ئێســـتا لەبەرامبــەرت وەســـتاوە، وەکــو تــارای خێزانـــــت لەیـــــەگ گــــەل و نەتـــــەوەن. هــــەروەها کوڕەکـــــەم مــــن خــــودی خـــۆم کوردەکـــانم زۆر خۆشـــــــدەوێت و ســـــــاڵانێکی زۆر دۆســــــــتایەتیم لەگـــەڵیان دا هەیـــە. بـــەڵام ئـــەوەی کـــە دەیبینـــین زۆر کــــات پیــــاوانی سیاســــین لـــــەپێناو بــــەرژەوە ندیـــەکانی خۆیـــــان دا جیـــاوازی و ڕق و کینــــەو زۆرجـــــــاران جـــــەنگیش لـــــــەنێوان ســـــــەرجەم گەلـــەکان درووســـت دەکـــەن، کـــەوایان لـــێ دەکـــەن رق و کینــــــە لەبەرامبــــــەری یـــــەکتر هـــــەڵبگرن

،کـــــەچی خۆیـــــانیش بەشـــــەوانیش خـــــەریکی بازرگـــانی و یـــاریکردنن لەســـەر مێـــزی یانەکانـــدا. تەنانەتـــە لـــەم نێوەنـــدەدا خـــەڵکی هـــەژار باجەکـــەی دەدات. بـــەڵام هەمیشـــە کەســـە ئاقڵـــەکان هـــیچ کەســـێک و هـــیچ نەتەوەیـــەک و ئاینێـــک و ڕەگـــەزێک بـــەدژی خۆیـــان دانانێن،بـــەڵکو ڕێـــز لەیـــەکتر دەگـــرن و بـــە خۆشەویســـتی و تـــەبایی ژیان بەڕێ دەکەن ...

***

–کوڕەکـــەم ، ئـــەم پیـــرە باوکـــەی تـــۆ پـــێش ســـی و پێـــنج ســـاڵ لەمـــەو پـــێش، وەکـــو گـــەنجێکی شـــێت کەوتمـــە داوی خۆشەویســـتی ، کچێکـــی جـــوانی کـــوردەوە، کـــە ئـــەویش ئـــەم دایکـــە پیـــرە جوانـــەی

تۆیە.هـــەروەها ئەمـــە چەنـــدین ســـاڵە تاکـــە پشـــت پـــەنای مـــن لـــەم ژیانـــەدا تـــەنها دایکـــی تـــۆ بـــووە کوڕەکـــــەم، بەتایبـــــەتیش لـــــە رۆژە ســـــەختەکانی ژیانمـــــان. ئـــــەو ســـــالانەی کـــــە ولاتەکـــــەم لـــــە جەنگـــــدابوو لەگـــــەڵ عێراق،لەپاشـــــانیش کاتێـــــک هـــــەواڵی کـــــوژرانی براکـــــەتمان پێگەیشـــــت لـــــەو جەنگـــــە نەفرەتیـــــەدا.ئیتر ناخۆشـــــترین ســـــاڵەکانی ژیانمـــــان بـــــوو بـــــۆ مـــــن و دایکـــــت . بـــــەلام هـــــیچ کاتێـــــک دەســـــتی یـــــەکترمان بەرنـــــەدەدا. بـــــەڵکو توانیمـــــان دووبـــــارە هەســـــتینەوە ســـــەرپێیەکانی خۆمـــــان و بـــــەردەوام بـــــین لـــــەژیانکردن. لەگـــــەڵ ئەوەشـــــدا هەرهـــــەنگاوێکم بـــــەبێ دایکـــــت مـــــن نـــــەمناوە لـــــە ژیـــــانم دا ، بـــــەڵکو هـــــەموو هـــــەنگاوەکانی ژیـــانم لەگـــەڵ دایکـــت بووە،تـــاوەکو

لەپـــــەروەدەکردن و گـــــەورەکردنی تۆشـــــدا هـــــەردووکمان بەیەکـــــەوە شـــــان بەشـــــانی یـــەکتردا، تۆمـــان بـــەخۆیوکردوەو،تۆمان گەیانـــدە ئەم رۆژە کە ئێستا وا لەپێشمان وەستاوی...

-بەهـــەمان شـــێوە پیـــرە دایکەکـــەی مورتـــەزایی، بـــە فرمێســـکەوە باوەشـــێکی توونـــد بـــە کوڕەکـــەی دەکـــات و پێـــی دەڵێـــت: کـــورە تاقانەکـــەم مورتـــەزایی گیـــان، ئـــەو شـــیرەی منـــت لـــێ حـــەلال بێـــت کـــە تـــۆم پێـــی گـــەورە کـــردوە، قســـەکانی باوکـــت زۆر راســـتن کوڕەکـــەم... مورتـــەزایی گیـــان رۆلەکـــەی دایـــە ،لـــەو رۆژەوە کـــە عـــەلی کـــوڕم ماڵئـــاوایی لـــەدایکی خـــۆی کـــردوە، هەمووشـــەوێک دڵـــم لـــەت لـــەت دەبێـــت بۆی،بـــەڵام لەلایـــەکی دیکـــەوە بـــوونی تـــۆ دەبێتـــە

ئازارشــکێنێک بــۆ ســەر دڵــە برینەکــەی ئــەم دایکــە پیــرەی تــۆدا. مــن ئێســتا وەکــو دایکێــک پێــت دەڵــێم: خێــرا بــڕۆ لەگــەڵ خێزانەکــەت بــۆ ســلێمانی ، چوونکــە ئــەو ئێســتا پێویســتی بــە تۆیــە لــەم بارودۆخــە هەســتیارەی دا،کــە لــەپاش چەنــدین ســاڵ لــە بێکەســی و دووری خێزانەکــەی، کــەچی ئــەو لــە ئێســتا لــەپاش ئــەو هــەموو ســاڵەدا توانیویــەتی بــە خێزانەکــەی شــادبێتەوە، بۆیــە کوڕەکــەم تــۆش لــەم رۆژەدا دەســتی تــارای خێزانــت بەرمــەدەو بەتــەنیا جێــی مەهێڵــە، چوونکــە تــەنیا دەســتەکانی ئــەو دەبێــت بــە هاوتەمــەنت و هاوســەفەری ژیانــت رۆڵەکــەم ، تەماشــای مــن و باوکــت بکــە چەنــدین ســاڵە دەســتمان لــەناو دەســتی یــەکترەو لەهــەموو

بارودۆخـــــــە ســـــــەختەکانی ژیـــــان دا، لەگــــــەڵ یـــــــەکتردا بوووینـــــــە بـــــێ ئــــــەوەی بــــــۆ چرکەســــــاتێکیش لێـــــک دابڕێین.بۆیـــــــە تــــــۆ نیگــــەرانی ئێمـــە مەبـــە، تــۆ لەهـــەر شــوێنێکی ئـــەم جیهانــــــە بیـــــت ، ئـــــەوا دڵنیابــــــە ڕۆڵەکـــــەم کــــــە بـــــەردەوام لــــــەناو دڵـــــی دایــــەو بابــــە خـــۆت دەمێنیتەوە...هـــــــــەروەها مورتـــــــــەزایی گیـــــــان ڕۆڵەکـــــەم هـــــەرگیز ئـــــەو شـــــتەش لــــەیاد نەکـــەی، کـــــە تـــــارای خێزانـــــت هـــــاو زمـــــان و هاونەتـــــەوەی ئـــــەم دایکـــــە پیرەتـــــە کـــــە ئێســــــتا لەبەرامبـــــەرت وەســــــتاوە، ئێمــــــەی کـــــورد لـــــــەو ڕۆژەوە کـــــــە چاوەکانمـــــــان کردۆتـــــــەوە بـــــــەردەوام بـــــــەرۆژانی زۆر نــــــــــاخۆش و ســــــــــەخت دا تێپـــــــــەڕیوین، بــــــــــەردەوام لەهەرچوارلامانــــــــەوە گـــــــــەمارۆ

دراوین.کــە تێیــدا بــە ئــارەزووی خۆیــان دەمــان چەوســێننەوە بــەبێ هــیچ هۆکارێــک. هەرچەنــدە کوڕەکــــەم تــــۆ لــــە بنەرەتــــەوە دەچیتــــەوە ســەرباوکت کــە کــوڕە فارســێکیت، بــەڵام ئــەوە لــەیاد مەکــە کــە تۆشــیری ئــافرەتێکی کوردتــت خــواردوە، کــە تــۆی پێگەیاندۆتــە ئــەم ڕۆژانە،کــە ئەو ئافرەتەش منم ڕۆڵەکەم دایکت...

–بــاوکی مورتــەزایی : خێــرا بــڕۆ کوڕەکــەم بگــە بــە تــارای هاوســەرەت پــێش ئــەوەی بڕوات،تــۆ ئێســتا واز لــەم دوو پیــرە دڵگەرمــە بێنــە، ئێمــە خۆمــان پشــت و پــەنای یــەکترین. تــەنها خۆشــی تۆمــان دەوێــت لەهەرشــوێنێکی ئــەم جیهانــە بیت...

*** 

مورتـــەزایی بـــە قســـەکانی بـــاوک و دایکـــی زۆر گاریگـــەر دەبێـــت، هـــەروەها بـــەچاوی پـــڕ لـــە فرمێســـــکەوە باوەشـــــێکی توونـــــد بـــــە دایکـــــە پیرەکـــــەی و باوکـــــە پیرەکـــــەی دەکـــــات، زۆر بەتوونـــــدی دەیـــــان گووشـــــێت. ماڵئاواییەکـــــەی مورتـــەزایی لەبەرامبـــەر دایـــک و بـــاوکی دا وەکـــو ئـــەوە وابـــوو کـــە چیتـــر نـــەیان بینێتـــەوە بـــۆ جارێکی تر...

-مورتـــــەزایی: دایکـــــە باوکـــــە ، ئێـــــوە تـــــاجی سەرسەرمن...

-دایـــک و بـــاوکی مورتـــەزایی: خـــوا ئاگـــەدارت بێت،ئێمەش شانازیت پێوە دەکەین...

بـــــەهۆی کێشـــــەیەکی تەکنیکیـــــەوە گەشـــــتی فڕۆکـــــەوانی نێـــــوان تـــــاران و ســـــلێمانی، بـــــۆ کـــــاتژمێر هەشـــــت و نیـــــوی بـــــەیانی دواخرابـــــوو، کـــــە خـــــۆی لەراســـــتیدا دەبوایـــــە تـــــارا لەگـــــەڵ کچەکـــــەی لـــــە کـــــاتژمێر شەشـــــی بـــــەیانی گەشـــــتیان بـــــەرەو شـــــاری ســـــلێمانی بکردبایـــــە. ئـــــەم دواکـــــەوتنی فڕۆکـــــەیش بـــــۆ مورتـــــەزایی ، دەبێتـــــە هـــــەواڵێکی زۆر خـــــۆش ، بـــــەهـــــۆی هانـــــدانی دایـــــک و باوکیـــــەوە ، تـــــوانی لـــــە بڕیارەکـــــەی خـــــۆی پەشـــــیمان ببێتەوە،چوونکـــــە لـــــە ســـــەرەتا نیگـــــەران بـــــوو لـــــەچوونی بـــــۆ ســـــلێمانی لەگـــــەڵ تـــــارای هاوســـــــەری لـــــــەپێناو دایـــــــک و باوکی،بـــــــەڵام بەپێچەوانەکەیـــــــەوە ،کـــــــەچی دایـــــــک و بـــــــاوکی

پەپوولە باڵشكاوەكان
بوونــــە گـــەورەترین پشـــتیوانی مورتـــەزایی و تـــارا لەم دۆخە سەختەدا...

(13)

پـــاش ئـــەوەی هیـــوا لەتەلەفۆنەكـــەوە ماڵئـــاوایی لــە تــارای خووشــكی كرد،ئیتــر هیــوا ئــەو شــەوە هــــیچ خــــەوێكی لــــەچاوەكانی دا نــــەچووبوو، بــــەڵكو تــــەنیا چاوەكــــانی لەســــەر چركــــەكانی كــــاتژمێر بــــوو، بەهــــەمان شــــێوەی دایــــك و خووشــــــكەكەی.هیوا لــــەچاوەڕوانی ئــــەوەدابوو ، كــە بــۆ جــارێكی دیكــە خــۆر هــەڵبیت و بتوانێــت لەگــــەڵ هــــەلاتنی خــــۆردا بــــە خووشــــكەكەی شادبێتەوە...

هیـــــوا بـــــۆ بەیانیەکەی،دەورووبـــــەری کـــــاتژمێر هەشـــــــت و نیـــــو بەخەبـــــەر دێـــــت، کاتێـــــک هەڵدەســـــتێت دەبینێـــــت کـــــاتژمێر( هەشـــــت و نیـــــوی) بەیانیـــــە، هیـــــوا بـــــەبینینی کاتەکـــــە زۆر دەشـــــڵژێت ، چوونکـــــە بـــــەلای خۆیـــــەوە ، وا هەســـــتی دەکـــــرد کـــــە ئێســـــتا خووشـــــکەکەی لـــــە فرۆکەخانـــــەی ســـــلیمانی چاوەڕێیـــــان دەکـــــات، بـــەلام تـــەنیا پێـــنج خوولـــەکێک پـــێش ئـــەوەی هیـــوا لەخـــــەو هەڵســـــێتەوە، ئـــــەوجا تـــــارای خووشـــــکی لەگـــــــــەڵ مورتـــــــــەزایی و منداڵەکـــــــــەی ســـــەرکەوتبوون بـــــەنێو فرۆکـــــەدا . بـــــەلام لـــــەناکاو هیـــــوا بـــــەدەنگێکی بـــــەرزەوە لـــــە ژوورەکـــــەی خۆیـــــەوە بـــــانگی دایکـــــی دەکـــــات و بـــــە دایکـــــی

دەڵێت: دایکە بۆچی منت زووتر بەخەبەر نەهێناوە؟

-ماڵەوەی هیوا خۆی لە ڕۆژانی دیکە نیمچە کزیەکی پێوە دیار بوو، بەڵام ئەمجارەیان بەتەواوەتی کش و مات بوو، چوونکە ئەمجارەیان دەنگی دایکیشی نەهات لەنێو ماڵدا، کاتێک هەست دەکات دایکی وەڵامی ناداتەوە ، ئیتر هیوا بەخێرایی بۆ خوارەوە رادەکات و بەرەو ژوورەکەی دایکی دەڕوات، بەڵام دەبینێت دایکی لەسەر تەختەکەی پاڵکەوتوە بۆخۆی ، هەروەکو ئەوە وابێت کە هیچ بیری لای هاتنەوەی کچەکەی نەبێت، هیواش لە دایکی نێزیک دەبێتەوەو پێی دەڵێت: دایکە گیان...دایکە گیان خێرا هەڵسەوە زۆر

درەنگـــــە ئێســـــتا خووشـــــکەکەم چاوەڕێمـــــان دەکـــــات لـــــە فڕۆکەخانـــــە ،خێـــــرا بـــــابڕۆین بـــــۆ پێشـــــوازیکردنیان، دایکـــــە گیـــــان هەڵستەوە،ئێســـــتا کاتی خەوتن نیە.

هـــــیچ دەنـــــگ و هەناســـــەیەک، لـــــەدایکی هیـــــواوە دەرنـــــەهات ،تـــــەنها لەســـــەر جێگاکـــــەی پاڵکـــــەوتبوو، هـــــیچ جووڵەیـــــەکی لێـــــوە نایـــــەت و هـــــەروەها پرخـــــە پرخەکـــــەی جارانیشـــــی نـــــەمابوو، ئیتـــــر ئەمـــــەش وا لـــــەهیوا دەکـــــات کـــــە بکەوێتـــــە دڵـــــەراوکێوە، لـــــەوەی کـــــە دایکـــــی شـــــتێکی لـــــێ بەســـــەر هاتبێـــــت، هەربۆیـــــە زوو دەســـــتبەجێ پەیوەنـــــدی بـــــۆ بەشـــــی فریاکـــــــەوتن دەکـــــــات و داوای بـــــــەهاناوەچوون لێیان دەکات...

❊❊❊

کـــەمتر لـــە پـــازدە خوولـــەک ، تیمێکـــی فریاکـــەوتن دەگاتـــە لای مـــاڵی هیـــوا لـــە گـــەڕەکی مەڵکەنـــدی، تیمەکـــە دەســـتبەجێ دەگەنـــە لای دایکـــی هیـــواو، تـــاوەکو پشـــکنینی ســـەرەتـــایی بـــۆ ئـــەنجام بـــدەن. بـــەڵام لـــەکاتی پشـــکنینەکەدا، کـــەچی تیمەکـــە بۆیـــان دەردەکـــەوێت دایکـــی هیـــوا زیـــاتر لەچەنـــدین کـــاتژمێرە دەبێـــت کـــە ترپـــەکانی دڵـــی لـــە وەســـتان کـــەوتووە ، هەربۆیـــە ناچـــاردەبن بـــەخێرایی بیگەیننـــە نەخۆشـــخانە،بۆئەوەی پشکنینێکی تەواوەتی بۆی ئەنجام بدەن...

هیـــواش کاتێـــک گـــوێ لـــەم قســـەیەی تیمەکـــە دەبێـــت ، بـــەدەم گریانـــەوە هـــاوار دەکـــات و

دەڵێـــت: دایکـــە گیـــان ... تکایـــە بـــەجێمان مەهێڵـــە بەســـــاقەو بـــــم ، ئێســــــتا تـــــارا دەگەڕێتـــــەوە دایکــــەگیان، تکایـــــە زوو هەڵســــــتەوە بابڕۆینـــــە پێشـــــوازیان،ئەی هـــــاوار تکایــــە دایکـــــە تـــۆش وەکو باوکم و نەرمین بەجێمان مەهێڵە...

دایکـــــی هیـــــوا لـــــە دڵخۆشـــــی بیســـــتنی هـــــەواڵی گەڕانـــــەوەی کچـــــە گەورەکـــــەی. ئیتـــــر نـــــەیتوانیوە ئـــــەو شـــــەوە بەرگـــــەی ئـــــەو خۆشـــــیە بگرێـــــت. هەربۆیـــە لـــە خۆشـــیە ترپـــەکانی دڵـــی لـــە وەســـتان کەوتبوون.بـــــەڵام ئیتـــــر کاتێـــــک کـــــە گەیاندیانـــــە نەخۆشـــــخانە ، پزیشـــــکەکان هـــــیچ شـــــتێیکان بەدەســـت نـــەدەهات بـــۆ ئـــەوەی رزگـــاری بکـــن، راســـــــتەوخۆ یـــــــەکێک لەپزیشـــــــکەکان بـــــــە غەمباریـــەوە بـــەهیوا دەڵێـــت: بـــەخۆت خۆشـــبی

کــــوڕی گـــەنج نـــەمان تـــوانی هـــیچ شـــتێک بـــۆ دایکت بکەین(بەداخەوە)..

-هیـــوا: نـــەخێر، نـــەخێر، نـــەخێر... ئێـــوە درۆم لەگـــەڵ دەکـــەن دایکـــم زینـــدووە ، ئـــەو دەبێـــت ئـــەمڕۆ بـــە کچەکـــەی شـــادبێتەوە نابێـــت بمرێـــت ، هەســـتەوە دایکـــە گیـــان بەتـــەنیا بـــەجێمان مەهێڵـــە .

-پزیشـــــک: بەداخـــــەوە کـــــوڕی خـــــۆم خۆزگـــــە درۆبایـــــە قســـــەکانم،بەڵام ئـــــەوە راســـــتیەکی تاڵـــــە بۆتان،دووبارە بەخۆتان خۆشبن...

هیـــوا: باشـــە دایکـــە گیـــان بـــۆچی ئێمـــەت بەتـــەنیا بـــەجێ هێشـــت؟ مـــن ئێســـتاکە چـــۆن بـــە تـــارای خووشـــکم بڵـــێم کـــە لەیـــەک کاتـــدا دایکمـــان و

باوکمان و نەرمینی خووشکم هەموویان مردوون، ئەو کچە چۆن بەرگە ئەم هەمووشتانە دەگرێت پێم بڵی دایکە گیان، بۆچی هیچ وشەیەک نالێیت دایکە... دایکە...دایکە...دایکە..

***

ئەوشەوەی کە تارا تەلەفۆنی بۆ دایکی کرد، لەپاشان دایکی پێش ئەوەی بانگی هیوا بکات ،راستەوخۆ وێنەیەکی هیوای کوڕی لەڕێگای نامەوە دەنێرێت بۆ تارای کچی، کەئەمەش وەکو ئەوە وابوو کە دایکی زانبێتی ئەو شەوە بۆی کۆتا شەوە لەژیانی دا، هەربۆیە ویستوویەتی ئەم خووشک و برا

تاقانەیـــــە لێــــک دانــــەبڕێن و بتـــوانن بەئاســــانی بەیـــەکتر شـــادببنەوە بـــۆ هـــەتا هەتایـــە... هیـــوا تەماشـــای کـــاتژمێری مۆبایلەکـــەی دەکـــات ،بـــەڵام دەبینێـــــت کـــــات زۆر بـــــەخێرایی تێپـــــەڕیوە ، کـــاتژمێر بۆتـــــە (دە و پـــازدە خوولـــەک). ئیتـــر هیـــوا ناچاردەبێـــت نەخۆشـــخانە بـــەجێ بهێڵێـــت و راســـــتەوخۆ بـــــەرەو فڕۆکەخانـــــەی ســــلێمانی بڕوات .

هیـوا لــە دڵــی خۆیــەوە گــوتی : باشــە ئێســتا مــن چـــۆن خووشـــکەکەی خـــۆم بناســـمەوە لـــەپاش ئـــەم هەمووســـاڵەوە ،کەهـــەرگیز هـــیچ کاتێـــک رووخساریم نەمبینیوە؟!

هیـــــوا بـــــە ناچـــــاری دەكەوێتـــــە ڕێ بـــــۆ فڕۆكەخانـــە، كـــەچی ئاگـــەداری ئەوەنیـــە دایكـــی پـــێش ئـــەوەی كـــۆچی دوایـــی بكـــات وێنەیـــەكی بـــۆ تارای خووشكی ناردوە.

بـــە رووخســـارێكی كـــزو ماتـــەوە بـــۆ خـــۆی لـــەنێو هـــۆڵی فڕۆكەخانەكـــە دانیشـــتبوو، لـــەچاوەڕوانی هاتنـــەوەی خووشـــكەكەی بـــوو، بـــەڵام هیـــوا دووبـــارە لـــەدڵی خۆیـــەوە دەڵێـــت: باشـــە مـــن ئێســـتا چـــۆن بـــە خووشـــكەكەم بڵـــێم كـــە دایكـــم كـــۆچی دوایـــی كردوە،ئـــای خوایـــە ئـــەم هـــەموو ناخۆشیە چیە؟ بەسەری ئێمەت هێناوە.

بێگومـــان بەبیســـتنی ،ئـــەم هەواڵـــە هەســـتێكی نـــاخۆش دەدات بـــەتارا كـــە شـــەوێك پـــێش ئـــەوەی

بـــــەڕێ بکـــــەوێت بـــۆ ســـــلێمانی،گوێی لـــــەدەنگی دایکـــی خـــۆی بـــوو، کـــەچی بـــۆ بەیانیەکـــەی دایکـــی ترپـــەکانی دڵـــی لەوەســـتان دەکـــەوێت و بـــۆ هـــەتا هەتایە بە جێیان دەهێڵێت .

تـــاراش لەگـــەڵ منـــداڵ و هاوســـــەرەکەی لـــــەناو فرۆکـــــەدان ، کـــــە چرکـــــە بەچرکـــــە دەژمێـــرێ َت بـــۆ دابـــــەزینی فڕۆکەکـــــەیان لـــــەناو فڕۆکەخانـــــەی ســـلێمانی. تـــارا جگـــە لـــەوەی بیـــری خێزانەکـــەی کـــــــردوە، لەلایـــــەکی تـــــرەوە بیـــــری شـــــارە جوانەکـــەی خـــۆی کـــردوە، ئـــەو شـــارەی کـــە بەشـــێکی کـــەمی لەتەمـــەنی منـــداڵی خـــۆی تێـــدا بەســـــەر بردبـــوو، بـــــەڵام هـــیچ کاتێـــک ئـــەو ڕۆژانـــــەی لـــــەیاد نـــــەکردوە کـــــە لەشـــــارەکەی و نیشتمانەکەی خۆی دا بەڕێ کردبوو ....

(14)

کــــاتژمێر یـــازدەی تـــەواو بـــوو، فڕۆکەکـــەی تـــارا لـــە نێـــو فڕۆکەخانـــەی ســـلێمانی نیشـــتەوە، ئیتـــر هیـــواش راســـتەوخۆ هەســـتی کـــرد کـــە دەنگـــی فڕۆکەیـــــەک لـــــەنێو فڕۆکەخانـــــەی شـــــارەکەی دەنیشـــێتەوە، ئیتـــر ئـــەویش بـــەرەو لای بەشـــی پێشـــوازی کـــردن دەڕوات بـــۆ ئـــەوەی بەشـــکەم بتوانێت بیان ناسێتەوە ،بەهەر رێگایەک بێت.

کاتێـــک تـــاراو نـــەرمین و مورتـــەزایی لـــە فڕۆکەکـــە هاتنـــە خـــوارەوە، راســـتەوخۆ نـــەرمینی کچـــی بـــە دایکی دەڵێت: دایکە ئێرە کوێیە؟

دایکیشـــــی وەڵام دەداتـــــەوە پێـــــی دەلێـــــت :
کچەکـــەم ئێـــرە ســـلێمانیە ئەوشـــارەی کـــە دایکـــت تێـــدا لـــەدایک بـــووە. نـــەرمین دووبـــارە پرســـیار دەکـــات دەڵێـــت: باشـــە دایکـــە بـــۆچی هـــاتووین بـــۆ ئێرە؟ ئێمە ماڵمان لە ئێرانە.

دایکیشـــی بەپێکەنینـــەوە دەڵێـــت: ئـــای کچەکـــەم ئـــەوە کـــەی پرســـیارە تـــۆی دەیکـــەیت، ئێمـــە هـــاتووین بـــۆ ســـەردانی داپیـــرەت و بـــاپیرەت و خـــاڵ و پـــوورت، نـــازانی چەنـــدە بیـــری تـــۆ دەکەن،بەتایبـــەتیش خـــاڵۆت ،ئـــەو تـــۆی زۆر خۆش دەوێت...

نــەرمین دڵــی بــەم قســەیەی دایکــی خــۆش دەبێــت و دەڵێــت: هــێ ... هــێ واتــە داپیــرە و باپیرەیــەکی ترم لە سلێمانی هەیە دایکە؟

-بــەڵێ کچەکــەم، داپیــرەو باپیرەیــەکی تــرت لــەم شارە هەیە .

تــارا هێشــتا بــێ ئاگایــە لــەوەی کــە نــە دایکــی مــــاوە نــــە بــــاوکی نــــە خووشــــکەکەی مــــاوە، تەنانــەت برایــەکی تاقانــەی مــاوە ،کــە ئــەویش بــە حەســــرەتەوە چــــاوەڕوانی بینینــــی خووشــــکەکەی دەکات.

***

سەرباری ئەوەی کە کچەکەی تارا لە ئێران لەدایک بووە، هەروەها باوکیشی پیاوێکی فارسە، کەچی ئەمە کاریگەری نەکردۆتە سەر ئەوەی کە نەرمینی بچکۆلانە ، لە زمانی کوردی بێبەش بکرێت، بەڵکو دایکی توانیویتی لەپاڵ زمانی فارسییەکەی لەگەڵیشیدا زمانی کوردی بەشێوەیەکی باش فێری کچەکەی بکات، کە هەرچەندە زمانە کوردییەکە زمانی دایکی نەرمینە، هەربۆیە ئەمەش دەبێتە زمانی یەکەمی نەرمینی بچکۆلانە.

***

ئەوكاتـــەی كـــە تـــارا نزیـــک دەبێتـــەوە لـــە هـــۆڵی پێشـــــــــوزای فرۆكەخانـــــــــە ، راســـــــــتەوخۆ مۆبایلەكـــــــەی دەردەهێنێـــــــت و تەماشـــــــای وێنەیـــەكی هیـــوای بـــرای دەكـــات ، بـــۆ ئـــەوەی بتوانێـــت لـــەم جەنجاڵیـــەدا بیدۆزێتـــەوە. هـــەروەها وێنەیـــەكی دایكیشـــی لـــەلابوو، بـــەڵام وێنەكـــەی دایكـــی زۆر كـــۆن بـــوو، هـــی ســـاڵانی كۆتـــایی هەشـــتاكان بـــوو ، لـــەكاتی كۆڕەوەكـــەدا تـــارا ئـــەو وێنەیـــەی دایكـــی بەدەســـتەوە بـــووە تـــاوەكو ئەمڕۆ پاراستوویەتی بەبەردەوامی .

*** 

كـــــوڕێكی گـــــەنجی هەژدەســـــاڵان، لـــــەنێو فـــــڕۆ كەخانـــەدا لەبەشـــی پێشـــوازیكردنەكەدا بـــە كـــزو

ماتـــــەوە بۆخـــــۆی دانیشـــــتبوو، کـــــە لـــــەدیار چـــــاوەڕوانی هاتنـــــەوەی خووشـــــکەکەی بـــــوو، کـــــە تەنانەتـــــــە بـــــــۆ یـــــــەکجاریش دەمووچـــــــاوی خووشـــــکەکەی خـــــۆی نـــــەبینیوە، جگـــــە لـــــەوەی کـــــە لەوێنەیـــــەکی کـــــۆنی منداڵیـــــدا بینیویـــــەتی و هـــــیچ تـــــر... بـــــەڵام لـــــەناکاو هیـــــوا گوێبیســـــتی دەنگێـــــک دەبێـــــــت، کـــــــە بانـــــــگ دەکرێـــــــت لەلایـــــــەن کەســـــێکەوە،بەڵام کاتێـــــک ســـــەری خـــــۆی بڵنـــــد دەکـــــات دەبینێـــــت خێزانێکـــــی ســـــێ کەســـــین، ئیتـــــر راســـــــتەوخۆ هیـــــــوا زەردەخەنەیـــــــەک دەکەوێتـــــــە ســـــەر رووخســـــارەکانی بـــــە بینینـــــی خووشـــــکەکەی و خووشکەزاکەی.

تـــــارا بـــــە ڕاکـــــردن بـــــەرەو لای هیـــــوا دەڕوات ، پاشـــــان دەســـــتبەجێ بـــــی هـــــیچ ســـــڵاوکردنێک، هیـــــوا

باوەشـــێکی توونـــد بـــە خووشـــکەکەی دەکـــات و پێـــی دەڵێـــت:دادە گیـــان تـــۆ لـــە کـــوێ بـــووی ئـــەم هـــەموو ســـاڵە؟ تـــاراش بەگریانـــەوە دەڵێـــت:من ئیتر لێرەم تاقانەکەی دادە گیان ..

بـــەڵام تاراهەســـت بەنامۆییەکـــە دەکـــات کـــە هیـــوا خـــۆی بەتـــەنیا لێـــرە یە،هەربۆیـــە راســـتەوخۆ تـــارا بـــە هیـــوای بـــرای دەڵێـــت: براکـــەم، ئـــەی دایکـــم و بـــاوکم و نـــەرمینی خووشـــکم لـــەکوێن ؟ ئـــەوان بـــــــۆچی نەهاتوونەتـــــــە پێشـــــــوازیم؟...هیواش بەتاســـەوە وەڵامـــی تـــارای خووشـــکی دەداتـــەوەو دەڵێـــت: خووشـــکەکەم شـــتێکت پـــێ دەڵـــێم بـــەڵام تکایـــە بەرگـــە بگـــرەو نەکـــەی لـــەهۆش خـــۆت بچیتـــەوە، تکایـــە. تـــاراش بـــە شـــپرزەییەوە بـــە هیـــوای بـــرای دەڵێـــت: چـــی بـــووە براکـــەم ئـــەوان

چیـــان بەســـەر هـــاتووە؟ شـــتێكم پـــێ بڵـــی بـــۆ خاتری خوا،وەختاكە دڵم لەت لەت بێت.

-باشـــە پێـــت دەڵـــێم خووشـــكم ،لەراســـتیدا بـــا جارێـــك ئێمـــە بـــڕۆین تـــەرمی دایكمـــان بـــەخاك بســـپێرین، ئەوجاكـــە، هەمووشـــتێكت بـــۆ بـــاس دەكەم لەماڵەوە...

تـــارا : چـــی! ئـــەوە تـــۆ باســـی چـــی دەكـــەیت براكـــەم؟ بـــە خـــاك ســـپاردنی چـــی؟ پـــێم بڵـــی دایكـــم كـــەی مـــردوە؟ مـــن دوێنـــی شـــەو قســـەم لەگەڵ كرد ...

هیـــوا: راســـتە خووشـــكەم ئـــەم بەیانیـــە ،كـــە هەڵســـتام لەخـــەو چوومـــە ژوورەكـــەی بینـــیم لەسەر جێگاكەی خۆی گیانی سپاردبوو.

تـــارا لـــەنێو هـــۆڵی فرۆکەخانـــەدا بـــەدەنگێکی بڵنـــدەوە هـــاوارێکی زۆر گـــەورە دەکـــات ، کـــە تەنانـــــەت بەهاوارەکـــــەی چیـــــای ئەزمـــــەری پێهێنایە هەژاندن.

هیــوا ئەوەنــدە شــڵەژاو بــوو ، لــەیادی چــوو کــە ســـڵاوێکیش لـــە زاوەکەیشـــی بکـــات. هـــەروەها نـــەیتوانی نـــەرمینی خووشکەزایشـــی لـــەباوەش بگرێـــــت،بۆدواجار هـــــەموویان خێـــرا خۆیـــان گەیانـــدە نەخۆشـــخانەو لـــەوێ دەســـتیان کـــرد بەتـــــەواکردنی مامەڵـــەی تەرمەکـــەی دایکیـــان، تــــاوەکو دەســــــتبەجێ پــــاش تــــــەواکردنی

مامەڵـــەکانی نەخۆشـــخانە راســـتەوخۆ بـــەرەو گۆڕستان ببیەن و لەوێوە بەخاکی بسپێرن...

*** 

پـــاش تـــەواو بـــوونی مامەڵـــەکانی نەخۆشـــخانە، کـــە زیـــاد لـــەنیو کـــاتژمێر پێـــوەی ســـەرقاڵ بـــوون ، بـــەڵام بـــۆ دواجـــار تەرمەکـــەیان گواســـتەوە بـــۆ یـــەکێک لـــە مزگەوتـــەکانی شـــار. بـــۆ ئـــەوەی نـــوێژێکی مـــردووی بەســـەردا ئـــەنجام بـــدەن، لەپاشـــان لەوێشـــەوە راســـتەوخۆ بـــەرەو گۆرســـتان بردیـــان. ئـــەوەی کـــە جێگـــای ناخۆشـــیە کـــە چـــاڵ هەڵکەنەکـــە دووبـــارە چـــاڵێکی تـــری لـــە تەنیشـــتی بـــاوک و خووشـــکەکەی هیـــوا و تـــارا هەڵکەنـــدەوە، کـــە ئـــەمجارەیان چاڵەکـــە بـــۆ

پەپوولە باڵشکاوەکان
خۆشەویسترین کەسیان بوو کە ئەویش دایکیان بوو...

-تارا بەبینینی ئەو دوو گۆڕەی کە لەتەنیشتی گۆڕەکەی دایکیەوەن بۆ ساتێک بێ دەنگ دەبێت و هیچ وشەیەکی لە دەمیەوە نایەتە دەرەوە ، بەڵام لەناکاو لەپاش چەند خوولەکێک بە هاوارێکی بڵندەوە ، دەڵێت: ئەمە چی روودەدات لێرە؟

هیواش بەتووندی باوەشێک بە تارای خووشکی دەکات و هەوڵدەدات ئارامی بکاتەوە لەو گێژاویەی کە تێکەوتەوە،پێی دەڵێت: تکایە دادە گیان لەبەر خاتری کچە بچووکەت خۆت ئازار مەدە ، تەماشای

خووشـــکەزاکەم بکـــە بزانــــە چــۆن دەترســـێت لــــە هەڵســـوکەوتەکانی تـــۆ، بۆیــــە خـــۆت کۆبکــــەوە تکایە،دایکیشـــم ئێســـتا لــــەنێو گــۆڕدا گــوێی لـــەتۆ دەبێـــــت .لەپاشــــان زۆر هەســـــت بەدڵتـــــەنگی دەکات دوایی.

-تـارا بــەدەم گریانــەوە بــە هیــوای بــرای دەڵێـت: بـــۆچی براکـــەم؟ ئـــەم هـــەموو ناخۆشـــیە بەســـەر ئێمـــەدا هـــاتووە، مـــن ســـاڵانێک لـــە دووری ئێـــوە بـــووم، کەهـــەموو ڕۆژێـــک وەکـــو زینـــدان بـــوو بـــۆم، کـــەچی ئێســـتا هـــیچ کەســـێک نـــەماوە لەخێزانەکــــەم، تەنانـــەت بۆکۆتاجـــاریش لەگــــەڵ دایکـــــم قســـــەمکرد، کـــــەچی ئـــــەویش بـــــەبێ

ئاگـــەداری مـــن ئێمـــەی بـــەجێ هێشـــت،تەنانەت ڕانەوەســـتا بـــۆ یـــەکجاریش لەباوەشـــی بگـــرم ،کـــەچی ئێســـتا هـــاتووم خـــۆڵ ئەکـــەم بەســـەر گۆڕەکەیدا.

نـــەرمینی بچکۆلـــە،ئیتر ئەوکاتـــە بێـــدەنگی دەشـــکێنێت و دەســـت بـــە پرســـیارکردن دەکـــات لـــەدایکی ،دەڵێـــت: دایـــە ئـــەوە گـــۆڕی بابـــە گـــەورە و دایـــە گەورەکـــەی منـــە؟ تـــاراش وەڵامـــی نـــەرمینی کچـــی دەداتـــەوە دەڵێـــت: بـــەڵی کچەکـــەم، ئـــەوە گۆڕەکـــەی بابـــە گـــەورەو دایـــە گەورەتە.

نـــەرمین: باشـــە دایکـــە بـــۆچی ئـــەوان مـــردوون ؟ ئـــەی تـــۆ نـــەتگوت: ئـــەچین بۆلایـــان بـــەڵام ئەوانـــە ئێســـــتا هــــــەردووکیان لــــــەژێر ئــــــەم خاکـــــەن، هەروەها هیچ دەنگێکیان نایەت.

-تـــارا باوەشـــێک بەکچـــە بچووکەکـــەی خۆیـــدا دەکـــات و پێـــی دەڵێـــت: کچەکـــەم ، تاقانەکـــەی دایـــە گیـــان ئیتـــر ئەمـــە ژیانـــە دەبێـــت هـــەموومان رۆژێـــک بێـــت و بمـــرین و بچینـــە ژێـــر ئـــەم خاکـــە تاریکەوە،چوونکــــە ژیــــان و مــــردن بەدەســــتی خۆمان نیەگیانەکەم...

نـــەرمین کچێکـــی بچـــووک و زۆر بەپرســـیار بـــوو ، دووبـــــارە بـــــەدایکی دەڵێت:ئـــــەی دایکـــــە ئـــــەو

نەرمینـــە کێیـــە؟ کـــە لەناوەڕاســـتی گۆڕەکـــەی دایـــە گەورەوە بابە گەورەدایە؟

-دایکیشـــی بـــۆ ســـاتێک بـــێ دەنـــگ دەبێـــت و تاســـێک دەبیـــات بـــۆ گۆڕەکـــەی خووشـــکی،بەڵام کچەکـــەی هـــەر ســـوورە لەپرســـیارەکەی خۆیـــدا، بـــۆ جـــاری دووەم هـــەمان پرســـیار لـــەدایکی دەکاتەوە،دایکیشـــی وەڵامـــی دەداتـــەوە دەڵێـــت: کچەکـــەم ئـــەوە پـــوورە نەرمینەکەتـــە ، ئـــەویش بەهـــەمان شـــێوەی داپیـــرەت و بـــاپیرەت ، فریشتەکان هاتن و ئەویان برد بۆخۆیان...

- بـــەڵام دایکـــە، نـــاوی پـــوورم هـــەمان نـــاوی منـــی هەیە؟

-تـــاراش بەکچەکـــەی دەڵێـــت :بـــەڵی کچەکـــەم ، ئەوکاتـــەی کـــە تـــۆ لـــەدایک بوویـــت، مـــن زۆر بیـــری خووشـــکەکەم دەکـــرد، بـــەڵام نەمـــدەزانی کـــە مـــردووە، هەربۆیـــە ئیتـــر هەســـتام نـــاوی تـــۆم بەناوی پوورتەوە کرد.

*** 

لـــەپاش بـــە خـــاک ســـپاردنی دایکیـــان و خوێنـــدنی نـــزا بەســـەر هەرســـێ گۆڕەکـــەدا، راســـتەوخۆ هـــەموویان گەڕانـــەوە بـــۆ ماڵـــە چۆڵەکـــەیان ، بـــەڵام کاتێـــک تـــارا پێـــی نایـــە ماڵـــە راســـتەقینەکەی خـــۆی، راســـتەوخۆ بـــەبۆنی ماڵەکـــە بوورایـــە ، چوونکـــە هەســـتی دەکـــرد ماڵەکـــە بـــۆنی کەســـە خۆشەویســـتەکانی لـــەناوی

دا دێـــت، هەربۆیـــە نـــەیتوانی بەرگـــە بگرێـــت. بەتایبـــەتیش هەســـتی بـــەبۆنی دایکـــی دەکـــرد لـــەنێو ماڵەکـــەدا بـــەجێ مـــاوە. لـــەپاش بوورانەوەکـــــەی دا مورتـــــەزایی، تـــــارای هاوســـەری بـــردە ژوورەکـــەی دایکی،لەپاشـــان لەســـەر تەختـــەی خەوتنەکـــەی دایکـــی درێـــژی کـــردەوە بـــۆ ئـــەوەی پشـــوویەک بـــدات و بەهۆشی خۆیدا بێتەوە...

مورتـــــەزاییش بـــــەدیار هاوســـــەرەکەیەوە ئـــەویش بۆخـــۆی پاڵکەوتـــەبوو . ناوبـــەناوە دەســـتی دەهێنایـــە پرچـــە خاوەکـــانی تـــارای خۆشەویســـتی ، بۆئـــەوەی کـــەمێک ئـــارامی بکاتـــەوەو بتوانێـــت ئـــەو ئـــازارەی نـــاو نـــاخی دڵـــی کەم بکاتەوە.

*** 

هیـــواش بـــۆ یەکـــەم جـــار، لـــەپاش گەڕانـــەوەیان لەســـــەر گۆڕســـــتان دا،تـــوانی باوەشـــێک بـــە نـــەرمینی خووشـــکەزاکەی بکـــات . هـــەروەها تێـــر ،تێـــر مـــاچی ڕوومەتـــەکانی دەکـــات و پێـــی دەڵێـــت: بـــۆنی پـــووره نـــەرمینی ڕەحمـــەتیت لـــێ دێـــت گیانەکەم، قوربانی خووشکەزاکەی خۆم بم.

نـــەرمینی بچکۆلـــە ، قســـە گـــەورەو زۆرزانەکـــەی خـــاڵۆی بـــوو ، ئیتـــر لەباوەشـــی خـــاڵی دەســـت دەکـــات بەپرســـیار کردنـــەکانی نـــاو مێشـــکی و دەڵێت: باشە خاڵۆ گیان بۆچی پوورم مردوە؟

هیواش وەڵامی دەداتەوە دەڵێت: گیانەکەی خاڵە، پوورت لە منداڵییەوە نەخۆشییەکی هەبوو، بۆیە ئیتر نەیتوانی زاڵبێت بەسەر نەخۆشییەکەی دا ، بۆ دواجار فریشتەکان هاتن و ئەویان برد بۆخۆیان...

-نەرمین دووبارە پرسیار دەکات و دەڵێت: باشە خاڵە پوورم کاتێک مرد بۆ کوێ رۆیشت؟

هیواش ماچێکی نەرمینی خووشکەزای دەکات، دەڵێت: قوربانی خووشکەزاکەی خۆم بم چەندە بەپرسیاری، گیانەکەم فریشتەکان هاتن و پووری تۆیان برد بۆشوێنێکی زۆر دوور کە هیچ کەسێک نازانێت لە کوێیە

ئەوشـــوێنە. تـــەنها ئەوکاتـــەی کـــە دەمـــرین ئـــەوجا دەزانـــین ئـــەو شـــوێنە کوێیـــە، بۆیـــە ئێســـتا نـــازانم گیانەکەم...

نـــەرمین: واتـــە خاڵـــە ئێمـــە دەبێـــت لـــەکۆتایی دا هـــەمووومان بمـــرین هـــەروەکو پـــوورم و دایـــە گەورەو بابە گەورەکەم؟

هیـــوا: بـــەڵی گیانەکـــەم هەریەکـــە لـــە ئێمـــە بـــۆ ماوەیـــەکی کـــاتی لەســـەر ئـــەم زەویـــە هەناســـە دەدەیـــن لەپاشـــان ماڵئـــاوایی لـــە یـــەکتری دەکـــەین بۆ هەتا هەتایە...

-نـــــەرمین زۆر بـــــەقوڵی دەچێتـــــە نێـــــو ئـــــەو پرســـــیارانەی کـــــە لەمێشـــــکیەوە هەڵـــــدەقوڵنرێت،

بۆیـــە دووبـــارە پرســـیار دەکاتـــەوە ،دەڵێـــت: واتـــە خاڵە جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ ئەم ژیانە؟

هیـــوا: نـــەخێر گیانەکـــەی خاڵـــە، بـــەڵام خۆزگـــە وابوایـــــــە بۆئـــــــەوەی جـــــــارێکی تـــــــر خۆشەویســــتەکانمان ببینیابایەوە،بــــەڵام نــــاتوانین بەداخەوە...

نــــەرمین: بــــەڵام خاڵــــە مــــن نامــــەوێت بمــــرم، چوونکـــە خـــەونی زۆر گـــەورەم هەیـــە لـــەژیان دا ئەمەوێت هەموویان ئەنجام بدەم.

هیـــوا: گیانەکـــــەم ، مـــــردن بەدەســـــتی هـــــیچ کەســـێکەوە نیـــە، بـــەڵام تـــۆ تـــاوەکو ئەوکاتـــەی بـــەردەوامی لـــە هەناســـەدان لـــە ژیـــان ، بـــەردەوام بـــە لـــە کـــارکردن بـــۆ خەونـــەکانت ، چوونکـــە ئێمـــە

پەپوولە باڵشکاوەکان
هەریەکـــەمان لـــەم ژیانـــە بـــۆ ئامانجێـــک دەژیـــن، هەربۆیـــە تـــۆش لـــە ئێســـتاوە بـــۆ ئـــەو شـــتەت بژی کە خۆت ئەتەوێت ،باشە گیانەکەی خاڵۆ.

نەرمین: باشە خاڵە باپیرەم بەچی مردووە؟

هیـــوا: ئـــای گیانەکـــەی خاڵـــە ،ئەوکاتـــەی کـــە گـــەورەبوویت ، ئـــەوجا دەزانـــی بـــاپیرەت بـــەچی مـــردوە ،چوونکـــە ئێســـتا منـــداڵی لەهەمووشـــتێک تـــێ ناگەیت،بۆیـــە ئـــەو پرســـیارە بیهێڵـــە بۆکـــاتی خـــۆی، چوونکـــە کـــاتی خـــۆی دێـــت ئەوکاتـــە هـــەردووکمان بـــە بەباشـــی دەزانـــین بـــەچی مردوە؟...

-باشـــــە بـــا ئێســـــتا وازبێنــــین لـــــەو پرســــیارانە ، ئێســــتا تـــۆ بـــەخاڵی خـــۆت بڵـــی بـــزانم پـــۆلی چەندی؟

نــــەرمین: ئـــەم ســـاڵ بێتـــەوە مـــن دەبـــم بـــەپۆلی ســـێی ســـەرەتـــایی، هـــەروەها مامۆســـتاکان منیـــان زۆر خۆشـــــــدەوێت،چوونکە لەهـــــــەموو کچـــــــەکان زیرەکم...

هیوا:هـــــەربژی خووشـــــکەزاکەی خـــۆم، بێگومــــان تـــۆ زیرەکـــی ،چوونکـــە ئێمـــەی کـــورد هەمیشـــە زیرەکین،بـــــەڵام بەداخــــــەوە کــــە چارەنووســــمان زۆر تەمبەڵـــە، باشـــەپێم بڵـــی چـــۆن و کـــێ فێـــری زمانی کوردی کردویت؟

پرسیارەکەی هیوا بۆ نەرمینی خووشکەزاکەی کەمێک نامۆ بوو...!

نەرمین: کوردی زمانی دایکمە خالۆ ، هەروەها داپیرەکەی ترم لە ئێران ئەویش کوردە ، هەروەها زۆریشم خۆشدەوێت داپیرەکەی ئێران، ئەویش منی خۆش دەوێت...

هیوا: باشە گیانەکەی خاڵە کام زمان بەلای تۆوە شیرینە؟ یان کام زمانت خۆشدەوێت (کوردی یان فارسیەکە)

نەرمین: ئم...ئم...ئم، بێگومان زمانی کوردیم خۆش دەوێت، چوونکە ئەوە زمانی دایکە جوانەکەمە لەگەڵ داپیرەکەی ئێرانیشم ، هەروەها کەمێکیش زمانی فارسیشم

خۆشـــدەوێت چوونکـــە ئـــەوەش هـــی باوکمـــە و لەگەڵ باپیرە حەسەنەکەی ئێرانم.

هیـوا: زۆرچاکــە ، ئــەی باشــە سـلێمانیت بــەلاوە خۆشە یان ئێران؟

نـــــەرمین:دووبارە ،ئم،ئم،ئـــــم.... ســــــلێمانین خۆشـــدەوێت خاڵـــە، چوونکـــە ســـلێمانی شـــاری دایکە جوانەکەمە...

هیـوا: زۆرباشــە گیانــەی خــاڵۆ، تــۆ ئێســتا بــڕۆ لــە ژوورەکـــەی مـــن بۆخـــۆت پشـــوویەک بـــدەو ، لەپاشـــان کـــە هەســـتایتەوە لـــە خـــەو مـــن ئەوبـــەم پیاســـــەیەکت پـــێ ئەکــــەم بــــەناو هــــەمووو ســـــــلێمانی دا، لەپاشـــــانیش دۆندرمەیـــــەکی خۆشت بۆ دەکڕم...

نـــەرمین : هـــێ ... هـــێ هـــەربژی خاڵـــە جوانەکـــەی خۆم.

❊❊❊

پـــاش ئـــەوەی کـــە تـــارا بـــە هۆشـــی خـــۆی هاتەوە،مورتـــــەزایی بـــــە تـــــارای هاوســـــەری دەڵێـــت: گیانەکـــــەم وابـــزانم ئیتـــر ئێمـــە هـــیچ کارێکمـــــان لێـــــرە نـــــەماوە، بۆیـــــە پێویســـــتە بڕۆینـــــەوە بـــــۆ وڵاتەکـــــەی خۆمـــــان، تـــــارا بـــــە رووخســـــارێکی پـــڕ لـــــە تـــــوڕەیی بـــــە مورتـــــەزایی دەڵێـــــت: نـــــەخێر مورتـــــەزایی هـــــەرگیز، ئیتـــــر نیشـــــتمانی مـــــن و کچەکـــــەم ئێرەیـــــە (ســـــلێمانیە) کوردســـــتانەکەم، ئەگـــەر ئـــارەزووی دەکـــەیت تـــۆ ئـــــەتوانی بۆخـــــۆت بگەڕێیتـــــەوە بـــــۆ ئێـــــران و

نیشـــتمانەکەی خـــۆت، چوونکـــە مـــن چیتـــر ناگەڕێمەوە بۆ ئێران.

ئـــەو هـــەموو ســـاڵەم لـــە دووری خـــاک و نیشـــتمان و خێزانەکـــەم تێپەڕانـــد، هەربۆیـــە مـــن و کچەکـــەم لـــەم ماڵـــە دەمێنینـــەوە لەگـــەڵ هیـــوای بـــرام، هـــەروەها بـــرا تاقانەکـــەم جگـــە لـــەمن هـــیچ کەســـێکی نـــەماوە کـــە دڵـــی پـــێ خۆشـــبێت ، بۆیـــە مـــن لـــەم کاتـــە چـــۆن دەتـــوانم براکـــەی خـــۆم بـــەجێ بهـــێڵم و لەگـــەڵ تـــۆ بـــێم بـــۆ ئێـــران مورتەزایی؟..

مورتـــەزایی هەناســـەیەکی قـــوڵ هەڵـــدەمژێت و بـــە تـــارای هاوســـەری دەڵێت:باشـــە گیانەکـــەم تـــۆ چۆنـــت دەوێـــت بـــا بـــەدڵی تـــۆ بێـــت، مـــادام وایـــە ،

مـــن ســـــبەی دەڕۆم مامەڵـــەکانمان تـــەوا و دەکـــــەم ، لەپاشـــانیش منــــیش لێـــرە دەمێنمــــەوە لەگــــەڵ هاوسەرە جوانەکەم و کچەکەم...

تـــارا: سووپاســـــت دەکـــــەم مورتــــەزایی گیـــان، خۆشەویســـــتەکەم ، کـــە تـــۆ لــــەم ڕۆژانــــە بــــۆمن بوویـــت بـــە پشـــت و پـــەنام... زۆرم خۆشـــدەوێیت موررتەزایی.

مورتــــەزایی : تاراکـــــەی مـــــن ئـــــەی هاوســــــەرە تاقانەکـــــەم ، ئەگــــەر لــــە ڕۆژێکـــی وەکـــو ئـــەمڕۆ مـــن لەگـــەڵت نـــەبم، ئیتـــر دەبێـــت کـــەی لەگـــەڵت بـــم؟ دڵنیابـــە هـــەتا کۆتـــایی تەمـــەنم لەگـــەڵت دا دەبـــــم ، هـــــیچ کاتێـــــک بەتــــــەنیا بـــــەجێت ناهێڵم،منیش تۆم خۆشەوێت تاراکەم...

بەم شێوەیە تارا و مورتەزایی بڕیاریان دا کە لەسلێمانی بمێننەوەو هەر لەم شارەدا درێژە بەکاری پزیشکیەکەیان بدەن ، کە توانیان نۆرینگەیەکی پزیشکی تایبەت بەخۆیان دا بکەنەوەو بەردەوام بن لەکارەکەی خۆیان دا ، هەروەها ئەو خانوویەی کە کەساڵانێک وەکو کرێ دایک و براکەی تێدابوون ،توانیان ئەویش بکڕنەوە بۆ دواجار بووە موڵکی خۆیان. لەگەڵ ئەوەشدا نەرمینی بچکۆلە لە یەکێک لەقوتابخانە باشەکانی شاری سلێمانی ناویان تۆمارکرد...

بۆدواجاریش هیواش لە زانکۆی شارەکەی دا توانی دەست بکاتەوە بەخوێندن لە بەشی

مێـــــژوودا ،چوونکـــــە هیـــــوا لــــــە منداڵیـــــەوە ئـــــارەزووی لـــــە، کتێبـــــە مێژوویـــــەکانی نێـــــو کتێبخانەکـــــەی بـــــاوکی بـــــۆ درووســـــت ببـــــووو. هەربۆیـــــە بـــــۆ دواجـــــار ئـــــەو ئارەزوویـــــەی بـــــەدی هـــــات کـــــە تـــــوانی لەبەشـــــی مێـــــژوو وەربگیرێـــــت، تـــــاوەکو لـــــە داهـــــاتوودا ،هیـــــوا بتوانێـــــت لـــــەرێگای بەشـــــەکەیەوە، نـــــاوی هـــــەزاران پەپوولـــــەی باڵشـــــکاوی نیشـــــتمانەکەی لـــــە لاپـــــەڕەکانی مێـــــژوودا تۆماربکات،کـــــە لـــــە ســـــەرەتادا بـــــەتۆمارکردنی نـــــاوی خـــــۆیی و تـــــارای خووشکی دەست پێ دەکات..